# گـــــەزیزە

«شێعر»


نووسەر:

ئاسۆ

صدا و سیمای جمهوری اسلامی ایران
کتابخانه
مرکز مهاباد

شماره ثبت: ۱۲۱۶۷
تاریخ ثبت: ۱۳۹۱/۱/۳۱
شماره رده بندی کنگره: PIR
۳۲۵۶
ن۳ ٤۳ م۸/

نام کتاب: گــــەزیـزە

نویسنده: محمدسعید نجاری (ئاسو)

نــاشــر: مـحـمدسعـید نجــاری (ئاسو)

لیتوگرافی: سایان گرافیک

حروفچینی: چاپ مهاباد

نوبت چاپ: اول

تیراژ: ۲۰۰۰

# به نێوی خودا

خۆم دەسوتێنم هەتا بەزمی خەڵک ڕۆشن بکەم
کێ لە ڕێی گەلدا وەکوو شاعیر دەسووتێ شەم نەبێ
"ماموٚستا هێمن"

لەو ڕۆژەوە یەکەم بەشی شێعرەکانم لە چاپ هاتەدر- تەوژمی خەیاڵ- چاپی محەمەدی سەقز بەهاری ٦٨- بە ئەو هەموو کەم وکووڕیەی کە هەیبوو دیتان، تا ئێستا وەبیری کۆکردنەوەی بەشی دووهەمی شێعرەکانم نەبووم- ئەگەر بکرێ پێیان بڵێی شیعر- لە زۆر جێگا و مەحافیلی ئەدەبی و خۆماڵی دانیشتووم و را و بۆ چوونی زۆر کەسم لەبارەی ئەو شێعرانە بیستۆتەوە. لە زۆر جێگادا پێیان دا هەڵکوتووم و زۆر کەسیش تووکیان لێ کردووم. زۆر مەمنوونی ئەوکەسانم کە هانیان دام تا لەم ڕێبازە نەکشێمەوە، بەڵام زۆرتر مەمنوونی ئەو شەخسانەم وەک شووشە شکانمیان تا تیژتر ببڕم.

خولاسە خۆهەڵکێشان و گلەیی و شکایەت مەبەستم نیە، کە چی عەمەلەن نووسینەکەم وای لێهات. نامەوێ دیفاع لە تەوژمی خەیاڵ بکەم چاوی دەرێ، خۆی دیفاع لە خۆی بکا، چاک بێ ژەنگ ناهێنێ. بە دەڵیش بێ شتی بە دەڵ خۆشم بێ و تاڵم بێ لەبەر چاوان دەکەوێ. بەڵام تازە ئەوکتێبە بوە شانە، بۆ ریشی[1] تازە هاتووم.

و چوو دە گیرفانمەوە هەرچەند ئێستاش لێی نەبان نیم. جگە لەوەی: خراپ نووسرایەوە- زووبوو- ویراستاری نەکرا هەوەلین ئەزموونی شێعریم بوو- و... هێشتا خۆشم دەوێ.

---

١ - ماڵی قەلب سەر بە ساحیبە

کاتێ برای دڵسۆزم کاک عومەری رەسووڵی کاسێتێ کی لەو شێعرانەی بە قەولی خەڵک ئەباتیل تۆمار کرد، لە کەم ماڵ هەبوو، لەم وڵاتەی خۆمدا کە لایەنگرێ ئەدەبی تێدا بێ و، ئەو نەوارەی نەبێ، دوایە دەچوون کتێبەکەیان دەکڕی و لەرووی شریتەکەوە دەیان خوێندەوە لە هەموان سەیرتر ناشرەکەم بوو کە کوتبووی لەو کتێبە زەرەرم کردوە و لە عەمباردا ماوەتەوە. ئەمە لە حاڵێکدایە کتێبی بە نرخی وەک سالم - حەمدی - حاجی قادریش زیاتر لە دوو ساڵ بوو چاپ کرد بوو نەدەفرۆشرا. جا ئەگەر تەوژمی خەیاڵ بە قەولی حافز ئەم «طفل یکشبه» لە دامێنی ئەواندا لە عەمبار بمێنێتەوە هێشتا زۆر هەڵکشاوە.

بەڵام زۆربەی ئیرادەکان لێم گیراون ئەمانەن:

١ - شێعری عاشقانەت زۆرن

ئاخر چ‌بکەم، از صدای سخن عشق ندیدم خوشتر «حافظ»!!! بە عەمەل سۆفیگەری سیاسیشم کردوە، بەڵام لە شێعردا خۆم فریو نەداوە هەرچی هەستی بزواندبێتم، خۆشم ویستوە و شێعرم بۆ گوتوە:

ماموستا هێمن گوتەنی: جیلوەیی جوانی لە هەر چیدا هەبێ خۆشم دەوێ.

٢ - شێعرەکانت هەمویان کۆنن

من بڕوام لەسەر کۆن و نوێ بوونی شێعر وەک ئەوانە نیە کە پێیان وایە کە شێعری نوێ دەبێ بە فۆرمی نوێش بنووسرێتەوە. بە رای من شێعری نوێ واتە قالبی شێعری نوێ (نیمایی - سپید - یا بە قەولی ئەو دیو حور) وەکوو قالبێکی تازە داهاتوو لە پاڵ ئەو ١٢ قالبەی دیکە دا(غەزەل - مەسنەوی - رباعی...) دەزانم.

ماڵم قەبرە قالبێکی خۆش و تازە و بەرفراوانە بۆ دەربڕینی هەستی خاوێن، بەتایبەت شێعری خەواسە، عەوام لێی حاڵی نابن ئیدی ئەوەی دوکتۆر پەشێو بەو پەڕی سادەگی هەموو شتێ بەو قالبە دەڵێ، ئیعجازە قسەی لەسەر نیە. من هەر شاعیرێک کە نەتوانێ غەزەلێکی ناب بڵێ، پێم شاعیرێکی بە دەسەڵات نیە با کافر بم. وەنەبێ شێعری نوێش نەڵێم. من لە هەوەڵی رێدام. ئەم رێگە هات و چوی دەوێ. تالەوادی شێعری کلاسیک نەپەڕمەوە ناچمە ناو دەریای شێعری تازەوە.

هەڵبەت بەم فۆرمە و بەم قالبەدانامن غەزەلی حافزم لە فارسی دا - هێمن لە کوردی دا - هێدی - نالی - وەفایی - هەمیشە پێ تازەن.

من هیچ کات بیرم لەوە نەکردۆتەوە کە ئەم شێعرە بە چ قالبێک بڵێم. غەزەل بێ یا مەسنەوی. دوو بەیتی بێ یا نوێ. بەڵکو ئەوە ناوەرۆکی شێعرەکە و دنە تایبەتیەکەی بوە وەزن و قالب و رەدیف و شتی وای لەگەڵ خۆی هێناوە. ناشڵێم شێعری شاعیرانی دیکە بێ تەئسیر بوون، نە من، نە هیچ کەس ناتوانێ بەهرە پێشوان وەرنەگرێ. «ئەخەوانی ثالث» دەفەرمێ: «نوێ بوون بە مانای لە بیر بردنەوەی رابوردوو نیە. جارێکیان ئوستادێکمان لە دانیشگا دەی فەرموو: خودا لە قورعان باسی سێ حەشەرەی کردووە.

ئەو سێ حەشەرە ئەمانەن: مێلوورە (نمل)، جالجالوکە (عنکبوت)، مێش هەنگوێن (نحل) دەیفەرموو بە بڕوای من ئەم سێ چینە شاعیرانن. یەکەم مێلوورە نمادی ئەو چینەیەکە هەر چی بە دمیاندا دێ دەیلێن وەک مێلوورە، لە سبەینێ هەتا ئێوارە هەرخەریکی کێشەوەن، هەر کۆی دەکەنەوە و تەعەهود و دات و بەڵێن داری تێدا نیە. ئەم چینە باش نین.

چینی دووهەم کە جاڵجاڵووکە نمادیانە. هەموو شتێکیان هی خۆیانە تاڵێ لە دەمی خۆیان بەدەوری ماڵیاندا دەتەنن کەڵک لە هیچ وەرناگرن تەمەشای دەور و بەر ناکەن بەڵام ماڵکەیان هیند بێ بونیانە، بە فوویەک با دەیبا، ئەم چینەش کارێکی باش ناکەن.

چینی سێهەم کە نمادی ئەوانە مێش هەنگوێنە، شاعیرانی راستەقینەن. لەهەر گوڵێ هەڵاڵەیەک دەمژن بەڵام دەیکەنە هەنگوێن و تەحویلی جەماعەتی دەدەن، ئەوانە شاعیری واقعی بۆ وێنە حافزی هێناوە. هەرچەند زۆر کەس لە سەر ئەم بڕوایە نیە ویستم وەک قسەیەکی خۆش بی گێڕمەوە. بەڵام خودا دەزانێ عیسان بە حافز بڵێ کۆن، بێ ئینسافیە.

کشتی بادە بیاور کە مرا بی رخ دوست گشتە هر گوشە چشم از غم دل دریایی

ئێستاش هیچ شاعیرێ بەزەینیدا نەهاتووە بادە تەشبیە بکا بە کەشتی. ئەدیکوا وەجهی شەبە؟ بادەی ئاوەکی لەگەڵ کەشتی سازکراوی دار یا ئاسنی؟ بەڵام ئەم ماڵوێرانە ئەو بەری شێعرەکەی دە زەینی دا بووە. هەرگۆشە چاوێکی بوەتە دەریایێ لە غەمی فیراقی خۆشەویستەکەی، کە وابوو

بۆ پەڕینەوە لەم دەریایە کەشتی لازمە. کەشتیەکی غەم رەوێن، جا لە بادە غەم رەوێن‌تر؟ ئەوەیە وەجهی شەبەە!!! ئەمە کۆنە، بەڵام ئەم وشە و ئیستعارە هەزاران جار دووپاتە کراوانـە تـازەن؟ دایکم زا - کەوێک فڕی! دارێکیان سووتاند - شەو زاڵە - یادت سێوێکی سوورە ...و...

شاعیرێکی نوێ خوازی کورد چۆن بەم شێعرەی حاجی‌قادر دەڵێ کۆن:

تا دەستی نەدا خەنجەر و نەی فەرموو دەسا دەی

حـاجی بکـوژن خـێرە ئـەدی مـەیدەن ئـەمانی

ئـیمکانی لە کـن ئـەو عـولەمای مـوودە قـەلێشن

عـــونقا و وەفـــا بـــوو چ دەهـــانی چ مـــیانی

جا بۆ شەرحەکەی رەنگە ٢ پەڕی بوێ بەڵام خولاسەکەی ئەمەیە هەروەک وەفا و عنقا هەر ناویان هەیە و خۆیان دیار نین دم و کەهەری مەعشووق دیار نەبوو تا بە دەم نەیکوت حاجی بکوژن لە کەمەریشی خەنجەری دەر نەهێنا.

نامەوێ بڵێم شێعری نوێ شتی وای تێدا نیە - دوکتور پەشێو و کاک شێرکۆ و کاک سوارە و... شتی وایان هەیە هیچ کەس نەیکوتووە، بەڵام دەلیلی ئەوە نیە هەرشتێکی بڵێی کەسێک کوتبێتی هەو نیە، بەڵام ئیدی هەر کەسێک هەستاو و بە دوو وشەی تازە سەر چاوەی پڕ لە ئاوی کۆنی ئەدەبی کوردی کوێر کاتەوە نە ئەو دەتوانێ و نە ئەویش کوێر دەبێتەوە... شێعر لەگەڵ زەمان و شەرایەتی سیاسی هەڵدەسەنگێ بڕواتـان هـەبێ دوای سـاڵێ دوو هـەزاریش هـێشتا نـالی - مەولەوی، وەفایی، ئەدەب، و هەژار، هێمن هەر تازە دەمـێنێتەوە. کـوێرایـیم دایـە کـوردی - شێخ رەزا - زاریم لە بیر چوو - کوڕە چووزانم باوەڕکەن هەرکام لەو شاعیرانەماڵێکی تایبەتیان بۆ خۆیان لە زەمەندی ئەدەبیاتی کورد دا دروست کردووە، کە قەت ناڕوخێ و هەتا هەتایە هەر تازەیە. باسی گۆران ناکەم کە نوێ خوازەکان پێیان وایە ئەو تازەیە، کە چی غەزەل و مەسنەوی هەر لەو جوانە.

زۆرم قسە لە دڵدا بوو بیکەم ، بەڵام نامەوێ بەم پێشەکیە بارستایی کتێبەکە زیاتر کەم چونکا لە پێشەکیدا بەنا لەسەر کورت دوانە. خوا یاربێ دەردی دڵەکان هەڵدەگرم بۆ نووسینێکی تر.

لەبارەی ناوی ئەم بەشە لە شێعرەکانم ناوی «گەزیزە»م هەڵبژاردوە، گەزیزە گولێکە لە زستان شین دەبێ، بەڵام مزگێنی بەهار دێنێ. خۆشم دەوێ پێم جوانە، هەر کەسیش گەزیزەی پێ جوان بێ خۆشم دەوێ. گەزیزە پێشکەش بە هەموو ئەو دڵسۆزانەیە شێعر لەگەڵ بارودۆخی خۆی هەڵدەسەنگێنن.

بەڵام پاش لە چاپ هاتنە دەری «تەوژمی خەیال» چاوەڕوانی نامەی زۆری دۆستانی نزیک و دوور بووم، کەچی بەداخەوە نزیکترین ڕەفیقانم لەترسی تیغی زمانی حەسوودەکان گاڵتەیان پێ دەکردم بەڵام ئەم دڵسوزانە بە نامەکانیان دڵخۆشیان کردم و دەتوانم بڵێم ئەم کۆمەڵە شێعرە تین و تەوژمی دەس خۆش و ڕاپەڕاندنی ئەوانە، دەنا لەوانە بوو لە هێلکەم بەرنەوە. جالەبەر ئەوەی بەداخەوە ناتوانم دەقی نووووسراوی ئەو بەرێزانە بنووسم بە نووسینی ناویان سپاسی گەرم و گوڕیان دەکەم و ئەرکی گەورەییان لەسەر سەر دادەنێم و بەو هیوایەی جێی ڕەزامەندی ئەو ئازیزانە پێک بێنێ.

١- کاک مارف ئاغایی لەورمێ

٢- خوشکێکی دڵسۆزی ئەدەبی کوردی لە مهابادوە

٣- کاک قادر ئازمەند لە میراوێ بۆکان

٤- کاک احمد جانانی لە بۆکان

ئەرکی سەر شانمە سوپاسێکی پڕ بە دڵ بکەم لە کاک حەسەنی نیاکان و کاک محەمەدی حەمەباقی کە لە تایپ و چاو پێ داخشاندنی ئەم شێعرانە چالاکانە یارمەتیان داوم.

بە هیوای دوا ڕۆژێکی ڕووناک بۆ هەموو لایەک

ئاسۆ

بۆکان ٦ی جۆزەردانی ٧٢

مـــن کــه جــارانــم تــریفەی چــاوی تــۆ بــوو رەهــنەما
ئێستە ناشوکری نەبێ خۆ یــەک تــرووسکیشی نــەما
شەو کە دادێ هەرچی ئەستێرەن لەچــاوی تــۆ دەچــن
وەک خــەیاڵت پــاکــی ئــەستێرەی ســەما دێــنە ســەما
تا رەشی زوڵفت لەسەر روخساری دووریت لانــەچێ
کوانێ بۆ شــوعلەی گــەلاوێژی نــیگات ئــەم بــێ تــەما
خەم وەکوو هاواڵی چاک ئێستە بە جــێی تــۆ دێتە لام
بــۆ چـــی نــاپرسی چلۆن مــاوم لە نــێو مــاڵی خــەما
من لە ژێر میحرابــی ئــەبرۆت چــاوەڕێی نــوێژی تــرم
هیندە تامەزرۆم لە بۆ یــەک ســوجدە پشــتیشم چــەما
کۆترە سپیە جوانــەکــەی پــیرم هــەتا کــەی بــێ ئــەتۆ
رابــوێرم عــومری ئـــەفسانەم لە گــۆشەی مـــاتەما
تۆ بڵێی جاریکی دیش کوێستانی رووی تۆم دەرکەوێ
تـــاوێ زولفــی لۆت بکــەم بۆ، یــا لە ســینەت دا کــەما
نـــمنمی چـــاوم نـــەبێ شـــۆعلەی فــیراقت دۆزەخــە
جا دەبێ ئەحواڵی دڵ چۆن بێ لە نــێو شــۆعلە و نــەما
سا وەرە و تۆبی خودا جارێ کە ئاسۆت روون کــەوە
بــۆ تکــا هــێنامە لای تــۆ «کــل شـــیی فــی‌السماء»

نــە گــەلاوێژە ســتێرەی غــەمەکــەم بـەڵکو تـەقا
گــۆمی مــەندی دڵ چــەشنی مــوسەللەس شـڵەقا
لەبــەر ئــەم ژیــنە کــە وەک ژانــە لە خـۆم بـێزارم
لام وەکــوو بــایە سکـەندەر هــەوەسی ئـاوی بـەقا
گەر چی جێی تیری موژەی یارە هەمو سـەتحی دڵم
خۆشە ئەو، تیری تەشەر ئێستە لەسەر جەرگە چەقا
مەی و مـەیخانە خـەرابـن ئـەسەفێ بـۆ کـەسەکـان
ئــێستە هــەر نـاحەقە چـنگی لە دڵـی تـەنگی حـەقا
شــــەوە تــاریکە تــەمە ســۆیێ لە ئــاسۆوە نــیە
عاسمان خـوێن دەگـرێ بـۆمە، لەنـێو چـەن تـەبەقا
نــاڵەیی ســینەیی پــڕ ســۆزی مـنە ئـەنگی هــەور
شوێنی جێ ماوە لەسەر پشتی هەموو بـەردی رەقـا
کەچی هیچ شوێنێ نـیە لەو دڵـە نـەرمەی گـوڵەکـەم
یــا نــــەخوڵقاوە دڵــی وا لە دڵــی مــا خــەلەقا
داخـەکـەم تـینی گـری شـێعری ئـەمن نـەچوە دڵـی
تــاکــو گــڕ خــانەوە ئـاسۆیە لە تــاپۆی فــەلەقا

بۆکان ١٤/٤/٦٨

## خزان

قلبم از این باغ خزانی گرفت
تک‌تک هر برگ زبانی گرفت
زمزمه عشق در این میکده
وا اسفا راز نهانی گرفت
داد،که شلیک تفنگی نخاست
او دل ما را به نشانی گرفت
شادی و غم هر دو متاعند و لیک
داد وی این بوده و آنی گرفت
آه و دم سرد گل از بوستان
گشته مه و مهر جهانی گرفت
شعلهٔ خاموش اجاق بهار
رفت دل بوته و جانی گرفت
بوتهٔ عریان مهراس از خزان
تا که بهارت به شبانی گرفت
تابش خورشید کرخ گشته از
گرمی قلب تو توانی گرفت
مهر من ای تابش احساس من
از تو مرا شور جوانی گرفت
از افق حادثه بر آی و تاب
خیل خزان را تو توانی گرفت
پار ندیدی که دم فروردین
لشکر آبان چنانی گرفت؟

ارومیه ۷۱/۸/۲۳

در سرم شوری به یاد آن نگار افتاده است
مرغ صبرم زآشیان خود بی قرار افتاده است
پیش از هر حلال مشکل بردم از این راز درون
گویدم گردش مگرد این کار زار افتاده است
هر دم از فرط جنونش بیشتر بیشتر گردد هوا
در هوایش شوق بیش و دل فگار افتاده است
باکم از دوزخ نی و ناصح نمیداند که دل
از تب بی مهریش اندر شرار افتاده است
شمس من بنمای رخ تا با تو گویم راز دل
جبر عشقت در سرم بی اختیار افتاده است
همچو نی می‌نالم از این شور کاندر سرفتاد
نی چو من کی اینچنین دور از دیار افتاده است
گوهر معنیِ چو سایم چون گهر خود در حجاب
از شعاع اشکی کز آن چشم یار افتاده است
«تاجبخشا» آزمایی این افق را با سؤال؟
بر دلش بنگر ببین او را چکار افتاده است

ارومیه بهار ۷۱

ای نسـیم مشکـبار از جـانب لیـلا بـیا
وی شـمیم نـو بـهار عـاشق شـیدا بـیا
در فراقت خار و خس نالید و من خس‌تر زخار
عـامل عـطر و عـبیر آگـین کـن گلها بیا
ای فـدایت دخـتر شـعر و عـروس خـامه‌ام
تـا شـود بـر پـا زسـینه مـحشر کبری بیا
روزها چون شب شبان بی صبح تا کی بسپرم
یـا هـمین امـروز یـا فـردا و پس فـردا بیا
بـر زبـانم شکـوه‌ها و در دلم صـدها نیاز
ای کـویر خـاطر عشـقم زتـو دریـا بـیا
تـا نـباشد جـایگاه اجـنبی مـیعاد مـا
بـی خـبر از هـر رفـیق و مـونسی تـنها بیا
در سـماء سـینه‌ام تـیر شـهابت راجـهان
در سـیاهی شـبم چـون زهـره زهـرا بـیا
تـا نـبینندت بـه روز آن جـاهلان کور دل
نـیمه‌های یک شـبی هـمچون شب یلدا بیا
بـی فـروغ چشـمهایت دیـدگانم بـی فـروغ
ای دو چشمت رشک صدها نرگس شـهلا بـیا
بـر افـق بـنما نگـاهی تـا زمـرآت رخت
بـاز یـابم دل شـود گـم گشـته‌ام پیدا بـیا

**ارومیه ۶۹/۱۲/۱۲**

دریـــــای امـــید دل مـــن بـــی تـــو کـــویر است
دور از نگـــهت مـــرغ تـــماشام اســـیر است
هـــر چـــند ایـار است و دمـن تـازه جـوانـی است
بـــنگر کـــه دل انـــدر غـــم هـــجران تـــو پـیر است
بـــر هـــر کـــه نـــظر مـــی‌فکنم نـــیست شـــبیهت
آری کـــه زانـســـان نـــه ایـــن ســـانت نـظیر است
صـــحرا چـــو بـــهشتی و جـــهان خـــرم و هـــر جـا
آواز نـــی و شـــرب مـــی و بـــانگ صـــفیر است
بـــی زهـــره زهـــرای رخت روز و شب مـــن
حیف است نـدانـی کـه چـه تـاریک چـو قـیر است
بـــر رهگـــذرم دام نـــدامت هـــمه جـــا هست
پـیوسته بـه‌دان پـای امـل بســته و گـیر است
افســـوس کـــه در کـــوی مـــحبت بـــه هـــمه عـمر
فـــرزند وفـــا چـــون دل اعـــدات ضـــریر است
بـا گـوشهٔ چشـمی بـه افـق یـادی زمـا کـن
دور از تو ضعیف است و غریب است و فقیر است

ارومیه ۶۸/۲/۱۸

هر که از ساقی چشمان تو جامی نگرفت
در عبادتگه دل جاه و مقامی نگرفت
روح دردی کش من و قابل تعمیر نبود
تا زپالایش لبهای تو کامی نگرفت
ای بس این گوش سرو جان به هوای سخنی
در شب یاد تو بر زنگ و پیامی نگرفت
کی زبان قادر افشای بهین عشق تو بود
تا زپا زند نگه شرح کلامی نگرفت
تا نکردی به من از روی محبت نظری
حرف روحم زقلم نظم و نظامی نگرفت
افقت را تن و جان کی بهم آمیخته بود
تا که از شعله عشق تو قوامی نگرفت

سبزوار دی‌ماه ۶۸

زۆر لە مێژە چاوەڕێم و نامەیێکی تۆ نەهات
گەرچی قاسید زۆرە نامەی دڵنوازت بۆ نەهات

وا گوڵاڵان هات و سەحرا پڕ گوڵ و رازاوە بوو
من عەجەب ماوم لە بەختم چۆن گوڵی رووی تۆ نەهات

بۆیە لەم وەرزی بەهارە بولبولی سەرخۆشی دل
هیچ هەوایێکی بە غەیری شیوەن و رۆ بۆ نەهات

ئەو بزەی رۆژی جودایيم جار بە جارێ دێتە یاد
دیارەمن خۆش باوەڕم، ئەو خەندەیەی بێ هۆ نەهات

دوێ شەوێ تاوێ سەرم کێشایە گوڵخانەی خەیاڵ
گوڵ هەمووی هاتن، کەچی هەر پەرچەمی شەو بۆ نەهات

هەر خەیاڵ و شێعرە جێی خالیتی پێ پڕ دەبنەوە
سەد خەیاڵ هات و کەچی شێعرێکی راستەو خۆنەهات

شەو لە شێعری بێ وەفاییت گوێی دڵم پڕپڕ دەبێ
خوا شوکور شێعری وەفای تێدا نەبێ ئەوشۆ نەهات

دور نیە ئەمڕۆ و سبەینێ نامەکەت وەک فووی مەسیح
دەوری هاتم بۆ بهێنێ و من بڵێم : لاچۆ نەهات

بازی خۆشبەختی بەرەو شەخسێ دەچێ بەختی هەبێ
خۆ بەناشوکری نەبێ قەت روو بەرووی ئاسۆ نەهات

بۆکان ۱۵/۳/ ۷

هیچ میدانی دو چشمت با من مسکین چه کرد
یا به تیر غمزه در این سینه بی کین چه کرد
برقی از چشمان تو جست و دلی در دام شد
با من افسرده این صیاد دل را بین چه کرد
شور فرهاد به سر افسوس تو آگه نه‌ای
فرق سر را از فراق و دوری شیرین چه کرد
در نمازم قبله روی تو در یاد آورم
وه که شیدایی نگر با اعتقاد دین چه کرد
کاش می‌دانستی ایدل شوق رویت در خیال
همچو آتش در لباس صوفی پشمین چه کرد
شادی اندر آسمان خاطرم چون خوشه بود
آفتاب عشق را بنگر که با پروین چه کرد
رو به سوی عاشقان بی دلت تا بنگری
از افق تیغ نگاهت با دل غمگین چه کرد

ارومیه ۶۹/۹/۲۰

تـا مـرا چشـم دل آن مـنظر زیـبای تـو بـاشد
هـمه افکـار دگـر در حـرم پـای تـو بـاشد
نــهراسـد زتـف آتش پـر سـوز مـلامت
عارف طبع نگون گشته که شـیدای تـو بـاشد
شـعله گـرم نگـاهت پـر پـروانـه دل سـوخت
زچه پـروا کـنم آنـدم کـه نگـه‌های تـو بـاشد
دل لبـریز خـیالت بـه لب بـام تـو آمـد
بـرود یـا کـه درآیـد بـه خـدا رای تـو بـاشد
به سلامی شوم از شوق چـو آن مـرغ بـهاری
هـمه دم نـغمه سـرا تـا گـل لبـهای تـو بـاشد
به خدایت که من از خود نسرایم که تـو ای تـو
شعر مـن تـابش سـیمای مـصفای تـو بـاشد
افـق از بـاغ جـمالت گـل رخسـاره نـبویید
گرچه در شهر سخن از من و غوغای تو باشد

ارومیه ۷۰/۱۰/۲۵

بولبولێ سرتەی ئەوینی خۆی بە گوێی گوڵدا چپاند
گوڵ بە ناز و غەمزە وە سەبری سەرێکی راوەشاند
چقلێ گوڵ راچوو لە پێی ئەو بولبولی وێرانە ماڵ
شێتی وا توندتر سکووتی ماڵی مەعشووقی شکاند
چارەنووسی عاشقی بێچارە بوو رۆژی بەرێ
هاودەمی چقڵە کەسێکی تۆوی ئەویناری رواند
دوێ شەوێ تیری مژۆڵێ روو بە رووی چاوم خرا
چی لەو نەکرا کەچی وا بەندی مەندیمی پساند
دی ئەویندارانە دەڕوانم لە ئەسرارم گەیی
ژەنگی سەر شووشەی خەیاڵی تاڵی پیریمی کڕاند
من لە نێو باغچەی نیگاهی مەست و مەدهۆش بووم کەچی
تا وەهۆش هاتم تەواری چاوەکەی دڵمی رفاند
ئەو منی تاوێ بە گۆشەی چاوی بێدەنگ کرد بوو
من ئەوم تاوێ لە نێو جێژوانی شێعری تەڕ دواند
من لە نێوچاوانی ئەودا کەوتمە نێو مەوجی خەیاڵ
ئەو لە نێو مەزرای دڵی من شەتڵی عەشقی خۆی چەقاند
هەستی ئاسۆ حاڵی ئەو شێعری حەریقە گەر دەڵێ:
(چاوەکەم ئەمڕۆ لە گوڵشەن گوڵ بە عیشوە خۆی نواند)

دیت کە چۆن بەندی قژی خۆت خستە مل ئاسۆی هەژار
چۆن لەسەر تۆ بوو بە سیبلی تیری تانەی خێش و یار
دیت کە چۆن شێعرت لە دلّیا بوو بە ئاوی زیندەگی
غەیری شێعری خۆت لە نێو دیوانی نەیهێشت ئاسەوار
من دەزانم چاوەکانت مەست ئەدرکێنن قسەت
سەد ئەوەندەی دیش بەڵەک بن شەرتە نەشکێنم قەرار
حەوشەکەی سینەت دەڵێی کۆلیجی عیشقی بێ غەشە
باغچەییێکی بێخەزانە و چقڵی چاوی سەد بەهار
تا پتر دەدوێیی لە گەڵ من زۆرترم تینو دەکەی
هەر لەیەک جۆی بووین دەبم زیاتر لە ئەووەڵ تاسەبار
وێنەکەت یاسێکی بۆنخۆش بوو لە گوڵخانەی خەیاڵ
وەک منالّ رۆحم گوڕووی لێگرتوی بۆ یادگار
شێعری من هیخۆم نیە، تۆی دێی و دەبزێوی لەبم
چۆلەکەی تەبعم کە بفڕێ دەیگری چەشنی تەوار

رووت مانگە دو لێوت وەکوو ئاقیقە موژەت تیر
بەدبەختە ئەوەی بەو تەمەشا دەیکەیە نێچیر
سەد رەمز و ئیشارەن لەشەتی شینی دو چاوت
بێ فەرقە لەبۆ غەرقی من و لاو و کوڕ و پیر
تۆ شیعەی و دڵنەرمی دەمی مانگی موحەررەم
یەخسیری چپرژانە وەرە مەمکە بە یەخسیر
بیرم بە گرێی میقنەعەکەت بامەدە دەئاخر
تا مانگی بوخارایە وەدەر بێ لەبنی بیر
یا خەیرە دەڵێی با نەخزێم بەو سەر و زوڵفت
تۆ حەقتە نەزەر بەڵگەیە ئیستا کە بە تەکفیر
سەر بەندی قسەت هێندە لەتیف و نەشە بەخشە
گوێم پڕپڕە لێی نامەوێ ئاهەنگ و مەزامیر
کۆرپەی دڵەکەم شەو بە خەیاڵت لە هەنیسکە
بێ مەم نەبێ، قەت کۆرپە بە شەو کەنگێ دەبێ ژیر
با بمگرێ ئەو لەرزە وەرە چاو لە دلم کە
ئاسۆت بەفیدا بێ مەکە تۆ لەم هەلە تەقسیر

سنە ٦٨/٥/٢٥

قەت نەبوو لێرانە یەک شەو پڕ بە دڵ نەگریم بەزار
وەک مەلی بێلانە وێڵ و تەرت و تووناى نێو دیار
ڕۆژگاری من لە ئەووەڵ ڕەش بوو وەک نووشتەی غەمم
بۆ بنالم من لە دەس بەخت و گەڕانی ڕۆژگار
دایەنی من مەینەتی بوو گۆچی کردم دایکی غەم
قەت لەسەر سەفحەی دڵم نەمدی لە خۆشی ئاسەوار
ئەو دڵەی زامداری هەستی بێکەسی و بێهاوەڵیم
کەس نەبوو تیماری کا غەیرەز چەقۆی دەستی نەیار
کامە دڵ نەرم و بەرەحم و یاوەری چەوساوە بوو
هەر کە من بەردەستی کەوتم بوو بە پۆڵای سەوزەوار
بۆ مەگەر من «ئەخوەلم» هەر دەشت و کێو ئاواتمە
«تا دەمی غونچەی ئەمەل ئەکرێنەوە سوبحی بەهار»
ڕۆشنی شەوگاری تارم هەرنەبوو تا هەم لە ژین
چاکە جارجار ڕوون دەکا کووچەی دڵم دوو چاوی یار
من کوڕی کوێستان و چۆم و بەندەن و دەشت و چیام
بێئەوێ دایم غەریبم نامەوێ کۆشک و تەلار
تۆ بڵێی جارێ نەکا، ئاسۆ! لە گۆشە مەرحەمەت
چاو لەحاڵت ئەو خودایەی خێوی ڕەحمی بێژومار

سەبزەوار ٦٨/٧/١١

روزها بگذشت و من در فکر یـارانـم هـنوز
دیگــران در مــنزل و مــن در بـیابانم هـنوز
شاپرک بر برگ گل لم داد و گل خندید و مـن
دل پر از خون گشته صد خار هجرانم هـنوز
کهنه گشته داستان لیلی و مـجنون زعشـق
لیک در نـجد فــراقت قــیس دورانــم هـنوز
مــی‌زنندم طــعنه تـوصیف خطّ و مـاهِ رو
طعنه بر بیجان چه حاصل کشتهٔ آنـم هـنوز
در دلم انــوار حــق مــی‌تابد و هـر دم زنـو
هــمچو تــاریکیّ مــویت نـامسلمانم هـنوز
یاد تو سُرخـاب شـادی بـر رخـم بـفشاند و
بی تو ایدل همچنان بر غصه مـهمانم هـنوز
در بــهار آرزویت مــرغ شــوقم پـر گـرفت
او قفس بشکست و من در تن به زندانم هنوز
شـعر مـن پـایان گـرفت و قـصه دل نـاتمام
دل به کردستان پرید و در خـراسـانم هـنوز

سبزوار مهرماه ۶۸

بـــەڵێ نـــامەی ئـــەوینی‌مە بـــەتەنیا دەفـــتەرێکە و بـەس
کـەشەرحی شیعر و پـەخشانی ئـەبەد نـایە لەئـەستۆی کـەس
هـــەوەڵ دێـری هـــەتا ئـــاخر ســـەراســـەر پـــاکـیە و عـیسمەت
لە ئـــاخر تـــا بـە ئـەووەڵ عـیشقە رۆحـە، جـا درۆی بـۆ چـەس!؟
دەمـــێ پـــەروانـــە مـەحکوومە و دەمـێ شـەم بـێ گـرە و سـاتێ
مـەلی عـیشق و ئـەوینمان شـەو دەبـێتە گـڕ وەکـوو قـەقنەس
هەمووی شەرمە، هەموی شەهدە، هەموو شێعرە، هەمووی شینە
کە شـەرم و شـەهد و شـێعر و شـین خـەڵاتی شـاعیرانـە و بـەس
گـــوڵێکم بـــوو لەنـێو بـاغچەی وشـــەی پـاراوی کـوردی‌دا
بـە کـووپە و کـوندە دەی‌ڕشـتە سـوراحـی دڵ شـەرابـی خـەس
بـــەڵام ئـــەی داخـــی داخـــانم مـــن و ســـاقی شـــەرابـــی وا
لەســـەر شـــانم فـری ئـــەو بـــازە هـەروەک شـۆخی و ئـەنقەس
لە مـــەولا شـــەرتە شـەونامەی ئـەوینت مـەشقی ژیـنم بـێ
لە بـــەندیخانەکـەی ئـاسۆ گـەلێ پـێم فـەخرەبم قـۆڵ بـەس

وەک قەڵەم کورت و شکاوە شەوپەڕی باڵی خەیاڵ
هێندە تیری شەو درا لێی شڕشڕە تاڵی خەیاڵ
ئۆف لەدەس شەوگاری دووری و بێبەیانی دڵپڕی
سەختە زۆر سەختە کە ئەسرین بێتە هاومالی خەیاڵ
هاودەمی فرمێسکی چاوی من بوو ئیمشەو شەم هەتا
بوومە لێڵەی بەربەیان گریا لە نێو ماڵی خەیاڵ
کێ دەکا هەستی دڵێکی کە ئەویندارە هەتا
نەیگرێ جەزبەی شەوانە و بێتە هاواڵی خەیاڵ
نایەتە نێو حاڵی کۆڕی سۆفیانەی دڵ هەتا
شێخ نەنۆشێ جورعەیێ لەو شەربەتی تاڵی خەیاڵ
تاوەکوو لاتیلی چاوێ نەیگەزێ جەرگی لە دوور
مەنجەڵی دڵ کوا وەکوڵدێ و دێتە نێو حاڵی خەیاڵ
من کە پێکراوی خەدەنگی چاوی یارم کوا دەکا
وەسفی حاڵی من زمانی ئەلکەن و لاڵی خەیاڵ
شەرتە تا ئاسۆی هومێدم روون دەبێ هەروا بە شەو
تێنەگا دوژمن لە ویستم بچمە ژێر باڵی خەیاڵ

سنه ٥/ ٤/ ٦٧

تاڵی مووت تەپکەی دڵ و کۆترێکی بەستەزمانە دڵ
چاوەڕێی راوچی ئەوینە و عاشقی گیرانە دڵ
تا ئەسیری تۆیە دڵ ئازادە ئەمما دوور لە تۆ
تینی تیشکی بێ تەوژمی رۆژ پەری زستانە دڵ
تۆ بە غەمزەی چاوەکەت هێناتمە جەغزی عیشقەوە
کەس نەڵێ تەقسیری دڵ بوو، شەرتە بێتاوانە دڵ
داری چاکی بوو کەچی تۆی دی گەشاوە وەک نەمام
وا چرۆی دەرکردوە و تەشرینی لانەیسانە دڵ
چاوەڕێی ئەو ساتەیە جامێ کەرەمکەی بۆ گەدا
وا بە لێوی ئیشکەوە هەر چاوەڕێی ئیحسانە دڵ
تەرمی سەد کۆرپەی ئەوینم لەم دڵەی‌دا ناشتوە
پاکی زیندوو بوون لەوێدابۆ ئەوین رزوانە دڵ
با لەسەر تۆ چەشنی مەجنوونم بەسەربێ بێخەمم
چون بەتۆی سابت دەکەم هێشتا لەسەر پەیمانە دڵ
تازە ئاسۆ تێگەیی چەن سەختە سووتانی ئەوین
بۆیە «ئەحمەد»[1] هەر دەڵێ: تو خوا بەسە بریانە دڵ

میراوا زستانی ١٣٦٦

---

١ ـ کاک ئەحمەد مەولانی دەفەرموێ لە شێعرێکی دا:

سووتاندمی ئاوری ئەوین تۆ خوا بەسە بریانە دڵ

رەفـیقان سـەیری حـالْم کـەن چلۆن دڵ پـڕکوڵ و تـابم
لە چـوارچـێوەی رکـەی غـوربەت ئـەسیری شـۆخێ نـایابم
سـەراسـەر تـیری پـەیکانن تـەماشای بـۆ دڵـی زارم
بەڵام ئەی شۆخی چاو بە خوماری رووەمەت چەشنی مەهتابم
دەمـاری هـەستێ نـابزوێنێ سـیلەی چـاوی بـیمارت
وەهـا تـێمەگـرە چـونکا مـن نـەچیری چاوی تـۆ نـابم
بەڵێ من ئەو پەپوولەی گێژی شەمعی جوانپەرەستی بووم
بـەڵام ئـێستا لە غـوربەتدام و هـەر پێم خـۆشە تـەنهابم
لە ئـازاری دەروون و زامـی هـەستم هـیچ خـەفەت نـاخۆم
دەترسێم گەر منیش وەک قەیسی مـەجنوون دووری لەیـلابم
کەژاڵی دیدە مەستی ئاسکی نـاسکی دەشـتی خـۆر هـەستان
نـەخۆشێکم بـەدەرمانی نـیگای چـاو حـەستەمە چـابم
دڵـی مـن تـینووە بـۆ یـەک دڵـۆپی ئـاوی کـوردوستان
وڵاتـی کـوردی گـورد و جـێی ژیـانی دایـە و بـابم
ئـەمن ئـاسۆی وڵاتـیوا گـەش و مـەزلووم و خـاپوورم
بـە دەردی خـۆمەوە جێم بێڵە بـا هـەر شێت و شـەیدا بـم

سەبزەوار ١٦/٩/٦٨

شماره ثبت ......١١٦٧٧
تاریخ ثبت ١٣٩١/١/٣١
صدا و سیمای جمهوری اسلامی ایران
کتابخانه


خۆزگە دەتزانی کە چەن مەجزووبی ئەو دوو چاوەتم
چەندە ماخولیا و کزی ئەو بسکە تێک ئاڵاوەتم
خۆدەزانم چەند خەیاڵی خاوە عەشقی تۆ، بەڵام
چونکە خاوم عاشقی ئەو بسکە لولو و خاوەتم
ئەو دەمەی ماندووی لەرێی مەکتەب دەشێوی شێوەکەت
من پتر سەودا سەری ئەو شێوە ئاڵۆزکاوەتم
هەر دەڵێی ئاسکی لە دوور را مەشقی دەشتی دڵ دەکەی
کەم بەناز هەنگاو هەڵێنە شێتی ئەو هەنگاوەتم
بۆ قوماری عیشقی تۆ هیچکەس نەبوو بی باتەوە؟
تۆ لە من گۆڕاوی و من ئەو شێتە ژین دۆڕاوەتم
رووت هەتاوی خۆشەویستی و بەژنەکەت داری شیعر
زۆر لە مێژە شاعیرێ بێبەش لە رووی ئەو تاوەتم
من خەتابارم لەتوی بەرگی غەزەل جێناگری
هێندە ناوت بەرزە ناگونجێ فیدای ئەو ناوەتم
رەو دەکەن تەیری وشە ئیمشەو لە هەڵپەرکێی خەیاڵ
تاکوو واشەی چاوەکانت ببنە دۆی نێو داوەتم
گەر بە چاو نەتدیوە بەرخی بێکەسی جێماو لەران
خۆمنت دیوە من ئەو بەرخی لەگەل جێ ماوەتم
تا بە شاباڵی خەیاڵت سینگی ئاسۆت دادری
مات و هەڵکورماوی دەست ئەو هێرشی شەو راوەتم

بۆکان ٧٢/٢/١٢

هـــيند دڵـم تـەنگە دڵـێم بـەو شـەوە لەم شـارە بـڕۆم
لە وڵاتـــێ کـــە جـەفا حـاکـم و ســالارە بــڕۆم
نە وەفای لای کەس و کـارە و نـەسەفای مـاوە ژیـان
با لەدەس بێبەزەیی هـەرچـی کـەسی و کـارە بـڕۆم
نـــامەوێ ژیــنی وەهــا پـڕ لە درۆ و رەنگ و ریـا
خـۆزگە بــەو رۆژە بـە تـەنها وەکـوو ئـاوارە بـڕۆم
دەور و بـەر چـەشنی نـەخۆشخانەیە دوکـتۆرێ نـیە
شەرتە لەو شوێنە کە دەرمان هەموو وەک ژارە بڕۆم
بو دەبێ هـەستی ئـەوین ژێـر دەسـی پـارە و پـلە بـێ
لە وڵاتـــێ کــە ئـەوین دایـمە لەپـای دارە بــڕۆم
تـەمە چـارشێوی شـێعر سـەنبولە رووبـەندی وشـە
بــا لە ئــەوجێ کـــە شـێعر هـەستی بـریندارە بـڕۆم
چـــونکە زۆرداری بـــەرەندەی گـــرەوی ئـەم گـەلەیە
عـــەهدە لەو شـــوێنە بـــەدەس تـــاقمی بـێعارە بـڕۆم
کــــێ دەزانــــێ چلەنـــێو ئــــەم دڵـــەدا رادەبـــرێ
لێـم گــەڕێن پـا بــە غـەمینی مـنی بـێ چـارە بـڕۆم
یــارمەتیدا کـــەسێ ئـــاسۆ، لەدەس ئـەم ژینە دەبـا
تاکو ئـەو جـێیە ئـەوین سـەروە رو سـەر دارە بـڕۆم

ترسم آن است که ناکام زتو پیر شوم
زَبَـرِ بامِ رضا ناشده و زیر شوم
گر بگویم سخن از غصه تو دلگیر شوی
ور ببویم گل رخساره نمک گیر شوم
شادم از آنکه من از فرط جنونت شب و روز
به کمند سر زلفان تو زنجیر شوم
رخ خود را بنما تاکه زنخچیر زمان
در بر پنجه شاهین قضا شیر شوم
که شنیده است گدایی به شبی شاه شود؟!
نگهی تا به شبی خسرو صد میر شوم
گر بنوشم نمی از ساغر چشم تو چه باک
که شرابی بشمارندم و تعزیر شوم
جای آن است که آلوده شود لب به قدح
تا چو منصور من از هر دو جهان سیر شوم
افق ار لب به لب جام می آلوده نمود
گفت شاید که به یک جرعه جهانگیر شوم

بوکان دی ماه ۶۹

وەکـو پـەروانـەیێ شـەیدا لە گـوڵی جـوان دەگـەڕێم
بە دەمـی ویشکـەوە بـۆ شـەونمی روویـان دەگـەڕێم
کـرو خـامۆشە مـەلی ویست و چـرای ڕێـی چـەمەنم
لە شەقامی شەوی رەش مـات و پـەرێشان دەگـەڕێم
شـەبەقی چـاوی گـەلاوێژ نـەبێ ڕێ نـابەمە دەر
من بـە شـەوقی کـەمی ئـەستێرەوە هـیمان دەگـەڕێم
بـێت و بـی‌بینمەوە جـارێ کـە گـوڵی سـووری ونـم
لەهـەموو شـێعر و وتـە و بـەیت و بـەیانان دەگـەڕێم
خۆدەزانم گـوڵی سـووریش تـەمەنی پـێنج و شـەشە
بـەڵێ ئـەمما لە سـەفای مـردنی زسـتان دەگـەڕێم
وەرەزم مـن لەشـەو و خـەوتن و چـاوبەستنەکـەی
لە هـەرای بـەرزی مـەلی سـەر لە بـەیانان دەگـەڕێم
مـن و بـولبول لە غـەمی وەرزی بـەهاری لەکـوڵین
ئـەو لەبـۆ گـوڵ دەگـری و مـن لە گـوڵاڵان دەگـەڕێم
تـا وەکـوو تـاوێ لە ئـاسۆ وەسـەری دێتەدەرێ
تاوی روون، من بە هەوای شێت و غەزەلخان دەگەڕێم

ورمێ ٢ی ڕێبەندانی ٦٩

من ئەو باڵەندەیەم قەت سڵ لەبەر پەرژینی شەو ناکەم
هەتا ئەبرۆ هەبێ جێژنە بەدینی مانگی شەو ناکەم
هەتاوێ‌وا لەنێو دڵمایە نووری خۆی بڵاو کردوون
لەبەر تیشکی ئەوا روونم سەما بۆ مانگەشەو ناکەم
مەلی سوبحێکی خۆش دوارۆژ بە گوێی دڵدا دەچرێنێ
کە دەنگی‌ویم لەگوێدا بێ خەیاڵم فێرە خەو ناکەم
چریکەی شاتەوارێ دێ لەسەر لووتکەی چیای هیوام
لەبەر سیحری پەیامی یادی قاقای خاسەکەو ناکەم
کە مزگێنی و هەواڵێ مەجلسێکی خۆم لەبۆبێنێ
ئەدی قەت ئارەزووی لێژنەی بوخارست و ژنەو ناکەم
قەشەی خۆشیم بە خەو دیوە لە نێو رووبـاری ئاواتم
هەتا ئەو شکبەرم وەسفی زنەی پڕ زیخ و چەو ناکەم
نەسیم مزگێنی‌یەک دێنێ سەبا بێخەی گوڵێک ئەدرێ
چلۆن چاوی دڵم لە میان و رووی هۆشم لەئەو ناکەم
لەبۆ پالاوتنی فرمێسکی شادی چاو و برژۆڵم
لە خەرمانی خەباتا چۆن بە بێژنگ و بە کەو ناکەم
بەهارەو روونە ئاسۆی ئەم وڵاتە جوان و رەنگینە
منیش چۆن سەنگەری شێعر و خەیاڵی خۆم پتەو ناکەم

**مەهاباد ٧١/٢/٢٧**

لە دارســــتانی لێــــڕی چـــاوەڕێییت بــێخەبەر مــاوم
لە زســتانی خـــەمی دووریت کـەسیرە و پـڕکەسەر مـاوم
دەپرسی چۆنم؟ هێشتا هـەر جـریوەی دێ مـەلی عـەشقم
لە شەوقی رووی وەکوو گوڵتە دەنا ئەیچۆنە هـەر مـاوم؟
هـــەواری چـــۆڵ و خـامۆشم کـە بێریش دەنگـی هـاوێری
لە ئەوکی شووشی زیندانە و منیش هەر دەس بەسەر ماوم
دەڵێن ئەهلی نەزەر تەنها بە چـاوێ حـەل دەکـەن مشکـول
ئەمن چبکەم کـە مـەحکوومی نـیگای ئـەهلی نـەزەر مـاوم
رەش و تــاریکە شــەوگاری هـومێد و ئـارەزووی زەوقـم
گەلاوێژ زۆر بەخێر بێی چۆن لە شـەوقی تـۆیە گـەر مـاوم
بەمن چـی حـور و غـیلمان و تـەعامی خـۆش لە ئـەولا بێ
کـە مـن ئێستا لەسـەر سـوفرەی بـەتاڵی مـاحەزەر مـاوم
وەرە ئەی دەستی فریاڕەس لەئەم رێ بگـرە دەسـتم چـون
لەچـــوار قــاشی وڵاتــێکی زەمـــەند و پـڕخەتەر مــاوم
وەرە ئــاسۆی هــومێدم روون کـــەوە تــاریکە شـەوگارم
لە مـــێژە بــێنیگای چــاوت بـــەبێ شـــەمع و فـەنەر مـاوم

رێگای بورهان گەلاوێژی ٧١

له کوێی کوڵی بێگەردی نەشەی تیشکی هەتاوم
بۆچ لێم ونی شێوەت بەدی ناکا ئەدی چاوم
هەر چەند له دڵداری و ئەوێ جێته هەمیشه
سەد خۆزگه بزانی چغەریبانه گەراوم
وەک ئاسکی له گەڵ جوێ هەموو سووچێکی دەنۆڕم
هەودای تەماشام کورته وه یا من خەڵەتاوم
کوا حەڵقەی ئەگریجه و ئەبرۆ و موژه ئێستا
بۆچاوی هەڵۆت مات و لەنێو مەرکەزی راوم
بێحەڵقەی زوڵفت بە هەموو چاوێ وەکوو باز
کوا دەدرێ گرێ تیشکی نیگای بێنەشه ماوم
یا خەیره دەڵێی من کە تەواری کەژ و کۆبم
پێم حەیفه هەموو کەس خەمه نێو حەلقەی داوم
تۆ ڕۆیی کەوا بازی دەکا بازی شکارم
دەی دەرکەوە با دەرچێ لەنێو شێعری شەتاوم
«مەعدوم» به سەفای روحەوە بێدەنگه کە یارەب
له کوێیه دنەی مەشعەری ئاسۆی عەبەساوم

بۆکان ١٦/٦/٧١

هەر کەوا دەنگی لەتیفت دێتە گوێم پێی شا دەبم
ئەودەمەی هێندێ لەبەندی رەنج و غەم ئازا دەبم
نەشئە بەخشە وەک شەڕابی موعجیزەی عیسا قسەت
سا وەرە تۆبی خودا با مەستی دەست ئەو بادە بم
بەژنی کوردانەت لەبۆ خۆی پاکی جوانی و زینەتە
چونکە ساکاری، فیدای ئەو بەژنە رێک و سادە بم
وەک دەڵێن وەعدەت وەها دابوو کە رۆژێ بێتە لام
خۆش بە حاڵم شەرتە تا هەم چاوەڕێی ئەووا دەبم
سەر لەبەر پێت کۆچی قوربانە کەسم گەر دێتە لام
جا بفەرموو کەی بە دڵتا دێ کە من ئامادە بم
ئەو کەسانەی پاسەوانی بارەگای عەشقن لە کوێن؟
وایە قەستم تا هەبم خاهانی ئەو ئەفرادە بم
خۆش هەواو و باسەفا و دڵگرە جادەی ئەوین
ئارەزوومە، رێم هەبێ، هەر رێڕەوی ئەوجادە بم
وا براکانم لە کەلیان داو لەسەر سوێن شاد و مەست
خوایە تا کەنگێ منیش لەم رێیە ماندوو و پیادە بم
رۆشنە ئاسۆی وڵاتی جوانپەرەست و راپەڕیو
دەک فیدای خاکی بەری پێی ئەو گەلە ئازادە بم

ورمێ ٧٠/٧/١٧

یـــارەب کـــە بـــەئەم پـــیریە گـــیری چکـــەسێکم
نازانی «عومەر»[١] ئێستە چلۆن بـۆت پـەرەسێکم
کـــاکـــە کـــە دەپـــرسی چـیە حـــاڵم لە چوەزعـــم؟
جـــارجـــارە بـــە حـــاڵ دێت و دەچـیێتن نـــەفەسێکم
یـــا رەب لە پشت پـــەردەیی غـــوربەت لە چحـــاڵم
یـا چـاو لە دەســی چـاوی چخـــەنجەر بـــەدەسێکم
هـــەر ساتێ لە رۆژ خـــەستەی دەردێکـی گـرانـم
هەر لەحزە لە شەو بەندی کەمەندی حەسەسێکم
هـــەستم لە دەروون دا وەکـــوو دەشـــتێکی بـــەهارە
دەڕوانـــمە دەورم مـــەلی نـــێو خـــار و خـــەسێکم
هـــەر وەک مـــەلی بـێئاوی تـــەمووزم لە کـــەویردا
بـــــەم حـــــاڵەوە گـــیرۆدەیی داو و قـــەفەسێکم
زوڵـــفێ بـــوەتە بـــەندم و چـــاوێ وەکـــوو دەریـــا
لەم بـــــەستن و خـــــنکانە نـــــیە دادرەســـــێکم
هەرکەس کـــە بـــەئەم دەردەوە گـــیرۆدە نـــەبووبێ
پـــێی وایـــە کـــە مـــن شـیێتم و یـا بـولهەوەسێکم
ئاسۆی شەوی یەلدایـە لەبـن زوڵـــفی دوهـــەنیەی
«یـــا رەب کـــە بـــە ئـــەم پـیریە گـیری چکـەسێکم»

**سەبزەوار ٦٨/٨/٢٩**

---

١ - ئەم شێعرەم لە سەبزەوار کاتی دانشجوییم وەک نامەیەک بۆ هاوڕێی خۆشەویستم کاکە عومەری رەسووڵی مەهاباد نووسیوە.

مــن از آن روز کــه بــه روت نـظر دوخـتـه‌ام
دفتر هـر چـه بـه جـز وصـف تـرا سـوخته‌ام
چونکه رسوا شوم ار عشـق تـو پـنهان نکـنم
جــامهٔ مُــهرِ خــموشی بــه لبــم دوخــتـه‌ام
ایــن هـمه‌قول و غـزل را کـه مـن انشـاد کـنم
اجر درسی است که من از چشم تو آموخته‌ام
تــــو زبـــازار وصـــالت طـلب صـــبر کـنی
وین مـتاعی است کـز اول بـه تـو بـفروخته‌ام
ســر بــه عــالم بــزند شـعله رسـوایـی مـن
از تــــف نـــاری کــه انــدر دلم افــروخته‌ام
مگــر آن نــور تــو بـدهد بـه افـق نـیم فـروغ
بس کــه از ســینه شب آه و غــم انـدوخته‌ام

سبزوار آبان ۶۸

من نـه آنـم کـه دیـده را بـیننده هـر در کـنم
زهــره آســا بـنگرم تـا مسـخ را بـاور کـنم
تا کـه آلوده نگـردد دست خـواهشـهای مـن
عــهد بسـتم دامـنم را زآب عشـقت تـر کـنم
روی تو آیات خـورشید جـهان هسـتی است
رخ متاب از من کـه ایـن آیـات را از بـر کـنم
از کلامت آتشی جـاری شـد انـدر جـان مـن
آنچنانم می بسـوزد تـرک جـان و سـر کـنم
اگــر نـوازشگـر شـود روح مـرا بـوی رخت
بی وفا باشم که یاد از سوسن و عـنبر کـنم
مکتب عشق تو خـود بـالاترین حـوزه‌هاست
کی هـوای درس و مشـق جـامع‌الازهـر کـنم
از خــم لعــل شـرابت گـر بـنوشم سـاغری
لول‌لول آهــنگ و قـصد عــالم دیگــر کـنم
خوش خراباتیست آن سیمای شعر انگیز تو
در تــخیل لب پــیاله چشــم را ســاغر کـنم
کــی افــق را روشــن دیـدار یکـدم مـی‌کنی
تــا دگــر کــم یــاد آن دیــدار آبـیدر کـنم

ارومیه ۷۰/۸/۲۱

این چه نگاه کردن است ای مه پر نگاه من
در شب تار عاشقی پرتو مهر و ماه من
هالهٔ دور ماه را دیده‌ای ای رشک جهان؟
آی و ببین به دور خود دایره‌های آه من
شبنم صبحگاه را کرده خجل زروی خود
ریخته اشک سرخ در دمدمه پگاه من
از در خود برانیم رو به کجای آورم
نیست جز آستان تو کعبه و قبله‌گاه من
سالک راه قهری و من به امید مهر تو
بین چه تفاوت است در راه تو به راه من
گر بنوازیم دمی بیخود از خودم کنی
گوشه چشمی بنما مرشد و شیخ و شاه من
در شب وعده‌گاه خود حال مرا که دیده‌ای
پس به قسم چه حاجتم تا تو خودی گواه من
نیست افق را زجهان ملجأ و مأوای دگر
دامن پر مهر تو در هر دو جهان پناه من

سقز - بوکان ۷۰/۴/۶

گەردوون وە چسەودایە کە داوینە لەسەری من
کام زولف و برۆ بوو کەخرا بەر نەزەری من
من هاودەمی ئەربابی حەدیس و عورەفا بووم
ئێستا کە لە مەیخانەیە، جێ پێ و ئەسەری من
کێ بوو بە گرووی ئەو دڵە منداڵە و شێتم
سینەی بوە هێلانەیی شێعر و هونەری من
ئەی شەو وەرە سا بەشقی خودا بکشێ بەسەرما
تۆی لانکی خەیالی دڵەکەی دەربەدەری من
تاوانی ئەمن چیبوو کەوا گیری ئەوین بووم
فێرگەی خەفەت و دەردە شەوی تا سەحەری من
بۆ چاوە، کە ئێستاکە لە دەریای خەوی نازا
کر خەو بوە ئەو مۆلەقە چاوی خەبەری من
یار شاپەڕەکی نێو گوڵی ئاوات و هومیدە
سیسیشە گوڵی ویست و تەمای بێسەمەری من
هیچ نیمە هومێدێکی لە نێو باوەشی ئاسۆ
تاوێ وەحەسێ چەتری هوما و تاجی سەری من

بۆکان ٦٧/٥/١٧

هـەر چـەندە بـەهارە و چـلەشە نـەوبەهاری مـن
تۆی تـیشکی هـومێدی دڵـەکـەی بـێقەراری مـن
فەسڵی بەهار و وەشتە بە گوێی بای سەبای دەڵێم
بـاوەشتە لەم بـەهارە یـەکـەم جـێ هـەواری مـن
مـن چـۆلەکـەیەک بـێپەل و بـێباڵ و بـێکـەسم
سەد خۆزگە بە خۆم کاکـە ئـەتۆ بـێتەواری مـن
فەرموو ئەوە شـێعرێک و دڵ و هـەستی ئـاگـرین
لێـم وەرگـرە تـۆ بـەشقی خـودا یـادگاری مـن
تـۆ ئـەوپەڕی ئـیحساس و لەتـیفی و بـەعاتیفەی
بزوێنەری هەستی و شەمی شەوگاری تاری مـن
جا شەرتە لەمەولا لە مەی و نـەی نـەکـەم بـەیاد
تا کووچەکـەتان بـێ چـەمەن و جـۆکـەناری مـن
هاواری ئەمن بۆ «دڵ» و بۆ «عیشق» و بۆ «گـەلە»
چاوێ کە لە مەجمووعەیی شـیعر و شـعاری مـن
لەم ڕێگـە ئـەگـەر لادەم و ڕێـم هـەتڵە بـێ کـەمێ
یـا ڕەبـبی! قـەڵەمکەی قـەڵمی ئـاسەواری مـن
سوێندم بە نیگاهی کە شەمی شـێعری لێدەهـات
ئاسۆی دوو چاوی تۆم و، ئەمەش بێقەراری مـن

بورهان بەهاری ٧١

بـۆ کـویێ دەڕۆی بـە هـەوا هـێزی چـاوی مـن
لایـێ کـەوە ئـەی بـەندی بـەلێنی پسـاوی مـن
بـێ‌تۆ سـەغیرە دڵـم پـڕ لە ئـاخ و داخ
نـاترسی بسـۆتێی بـە هـەناسەی هـەناوی مـن
وەک زوڵـفی پـەرێشانی ئـەتۆ فـیکر و خـەورەوا
چـاویێ کـە لە فـیکر و لە خـەیاڵی بـڵاوی مـن
هـێلانەیی دڵـمان سـرە وا بـێ‌تەوژم و تـین
یـادیێ‌کـەوە لەو جـێگە کـەوی دەنگ بـراوی مـن
هیچ مـاوە لە بـیرت شـنە و تـینی شـیعری خـۆت
گویێ بگرە لە دووت شینە هەموو بەیت و باوی من
نـانا مـەڕۆ وەرەوە سـەختە هـەڵبران
بـێ‌تۆ نـەشەی نـیە شـووشەی شکـاوی مـن
پاییزە بـەهارم هـەموو رەنگ زەردە پـەلکی گـوڵ
تـۆی ئـاوەدێری گـوڵی دوورە ئـاوی مـن
دەر حەق بە ئەمەک ناسی و عەشقی چەلان گوڵم
یـادیێ‌کـە، لە کـاولاشی لە خـەمدا خـناوی مـن
ئێستا کە دەڕۆی هەوری گـرینم دەهـێنێە جـۆش
ئیستیێ گرە، بـا تـەڕ نـەبی بـەو رێـژنە تـاوی مـن
تـۆ چـۆن دەڕۆی و لە ئـاسۆ دەبـی ئـاوا، مـەڕۆ
ئاوا مەڕۆ وەرە بیشووە لکەی شـەرمی ناوی مـن

سنته ٦٧/٦/١١

تـــا وەکـــوو قـــەیتانی لێـوی تــۆ خـــتیلکەی دڵ ئـــەدەن
شـــادەمار و مـــوورەگـــی شـــیعرم هـــەموویان چـڵ ئـەدەن
تـۆ و فـریشتەی شـیعری تـەڕ دابـەزنە هـەر بـاغچەی دڵـێ
دوو پـــەری شـــێتن فـــریوی ســـەد کـــەسی عـــاقڵ ئـــەدەن
دەفـــتەری ســـینەت ئـــەگـەرچـی نـەرمە نـووسراوی رەقـە
غەیری خێڵی شیعر و دڵ شەرحـی خـەڵک مـوشکوڵ ئـەدەن
مـن دەزانـم خـەڵکی کـام شـاری تـرووسکەی تـاوی روون!
خـــەلکی ئـــەو شـــوێنەی لەوێدا دڵ دەبـەن جـاگـوڵ ئـەدەن
تـــیشکی هـــەر لاتـــیلی چـاوت هـــێندە گـــەرم و پـڕ وتـەن
بـــێدرۆ بـــۆنی هـــەوێنی شـــیری شـــیعری ســـڵ ئـــەدەن
داوەرانـــــی وەســـــفی تـــۆ بـــاتڵ دەزانـــن کـــوا لە کـــوێن
بـــێت و جـــارێکت بـــبینن حـــەق بـــە ســـەد بـــاتڵ ئـــەدەن
نەک خـەیاڵت سەوزە وەک کوێستانی سـونبول بـۆنی کـورد
خەتتی سەوزی شێوەشت هەر رەنگ و بۆی سونبوڵ ئەدەن
روونـــە ئـــاسۆی ئـەو وڵاتـەی لاوی ئـازا و جـوانـپەرەست
تۆوی گوڵاڵەی سووری خوێن هەر شەو بە خاک و گڵ ئەدەن

مهاباد- ورمێ ٧٢/٢/١

لە دڵدا سازی ناسازی خەیاڵی خاتیرەی جاران
دەناڵێ وەک زەمانێ گەر نەبووم وا تەفرەقەی شاران
هەناسەم ساردە ئەمما دڵ بە یادی یارێ هەر گەرمە
کە هێشتا ناوی بۆم دەشتی لەگەڵ سروەی گەڵای داران
شنەی با سەرنەوای چیرۆکی عەشقی ئێمە بوو رۆژێ
ئەگەر شەو با، شنەی شەوبا بوو پەیکی رازی دڵداران
بەبێدەنگی کز و ماتی لەبن بەردێکی دانیشتووم
کە جاران جێگەمان وێبوو هەموو دەم کاتی ئێواران
بەڵام ئێستا بە تەنها من لەبن ئەو بەردە دانیشتووم
بەبێ‌هۆ چاوەڕێم ئەوبێ ئەدی قەد نایە وەک جاران
منیش وەک خۆم نەماوم دەنکە دەنکە مووی سپیم دەیڵێ
فەقەت ئەو بەردە وەک خۆیە نییە دەربەستی باو باران
بەڵام ئەی بۆچیوا تاسەی وەها داوینگری دڵمە
لە دڵمایە و بەسەر ناچێ و لەبیر ناچێ ئەبەد، یاران؟
یەقین هەر چاوەڕێم بێت و لە بەحسی عەشقی دڵپاکی
بڵێ پێموا نەییکیتر لە کۆلیجی وەفاداران
بەڵێ ئوستادی من ئەوبو بە بێ‌حەرفێکی دەرس ودەور
کەلامی وی نیگایەک بوو لە کۆڕی دیدە بیماران
بەڵام ئێستا کە ئاسۆیە سەراسەر هەر هەوای پێشوو
(لە دڵدا سازی ناسازی خەیاڵی خاتیرەی جاران)

ساروقامیش ٦٥/٥/٢٦

سەرم مەستی هەوای هاورازە ئەمشەو
دڵم گەرمی وەفای چاوبازە ئەمشەو
لەپەردەی گوێچکەدا دەنگی لەتیفی
بەیادی حافزی شیرازە ئەمشەو
بەڵێ: یادی بەخێر ئەوکاتە ئەمما[1]
لەکن من ئەوهەوا هەر سازە ئەمشەو
قەناری تەبعی شیعرم دێ ورینگەی
کە هاونالەی تەوار و بازە ئەمشەو
بە مەرگت تاری عیشقم کۆکی کۆکە
بەیادی تۆ، لەسەر ئاوازە ئەمشەو
مەلی دڵوا بەرەو هێلانی سینەت
لە مێشکیدا هەوای پەروازە ئەمشەو
بەدەنگی داودی و ئەرژەنگی مانی
گوڵم ویستی لەسەر ئیعجازە ئەمشەو
عەزیزم خۆزگە دەتزانی لە دووریت
دڵی کەیلم چەنێ بێنازە ئەمشەو
وەرە ئاگر لە تووی سینە بەردە
کە جۆگەی ئەشکی بێئەندازە ئەمشەو
مەترسێ لەو شەتاوی چاوی «ئاسۆ»
سەرم بۆت چەشنی بەردی بازە ئەمشەو

ورمێ ٧١/٧/١٨

---

١ - هەوێنی ئەم میسرەعە ئەو شیعرەی حافزە کە دەفەرمێ: «یاد باد آنکه سر کوی توام منزل بود»

# بڕۆ

گــوڵەکــەم شــاری دڵــم پــاییزە لێــی داوە بــڕۆ
تــۆ گــەشی هــەڵدەپڕووکێی مــەیە ئــەو نــاوە بـڕۆ
چۆڵگەیە و کـاکـی بـە کـاکـی نـیە تـێیدا نـەفەری
ڕێگــەی ئــەم شــارە بــە داوی خــەمە تــەنراوە بـڕۆ
نــامەوێ پــێت لە چڵی داوی خــەمێ گـیربێ گـوڵم
زولفــی تـۆ بـۆ دڵێ سـەدها وەکـوو مـن داوە بـڕۆ
بولبولی بێکەسی دم پڕ لە هـەرات جـواب کـە بڵێ
تۆ دەبـێ هـەر قـەفەسی بـی بـەشە وا بـڕاوە بـڕۆ
گوڵەکەم شاری دڵم بۆمبی جەفای بوو بـە خـەڵات
تــا لەشت بــەم گـڕە مشــقاڵە نــەسووتاوە بـڕۆ
هەمووکەس لێـرە دەزانـن کـەدنەی شـیعری مـنی
لەهــەموو بــەزمێ ئــەوینی مـن و تـۆ قـاوە بـڕۆ
تــۆ هــەڵۆی بــەرزەفڕی شـاری دڵـم نـزمە لەبـۆت
بــێبەڵابی گــوڵەکــەم کـوا ئـەوە جـێی ڕاوە بـڕۆ
هــەردەبێ ڕۆژێ بــە ئـازادی لەگـەڵ یـەک بـدوێین
ئـێستە وا دڵ بــە تــەمی وســتەوە تـاساوە بـڕۆ
گەر دەترسێی لەوە ئاسۆ خەمی تۆی دەرچێ لە دڵ
تــا ئــەبەد تـەوقی وەفـای تـۆی لەمـلا مـاوە بـڕۆ

❁❁❁

بـۆ مـەگـەر بـانگی مـناڵی مـن هـەر ئـاه و نـاڵە بـوو
چونکە کـام سـاتم بـە خـۆشی رابـرا بـەو حـاڵە بـوو
دێـتە بـیرم مـن بـە مـنداڵی سـەری سـاڵی کـەمی
شادی و خۆشیم بە خەو دی ئیدی هەرئەو ساڵە بـوو
جامی سەر لێوم یەقین بوو مـەززە فـرمێسکی وەوێ
بـۆیەوا سـاقی خـەیاڵم چـاوی چـەشنی پـیاڵە بـوو
دانی خاڵی بـوو لەسـەر تـەپکەی بـناگۆی دای فـریو
تەیری دڵ تاوانی چی‌بوو گشت خەتای ئەو خاڵە بـوو
هـەر تـریفەی چـاوی کـاڵێ رۆشـنی هـاویشتە دڵ
دڵ لەبەر دەستی بە مەستی سفرەکـەی ئـاواڵـە بـوو
شاڵی دووسەد چاک و پیرم خستە دەستو و گەردەنم
ئێستە ناوێرم بـڵێم دەرمـان نـە هـەر ئـەو شـاڵە بـوو
تێپەڕی عـومرم لە سـی‌وپێنج و لەبـاغچە ژیـنی مـن
حـاسڵی عـومرم فـەقەت ئـەم رۆژە تـار و تـاڵە بـوو
ئەو دەمەی ئاسۆ لەبەر چاڵی چەنەی چاوکاڵی کـورد
شیعری شایەر بوو بڵێچی بەندی نێو ئەو چاڵە بـوو

بۆکان هاوینی ٦٩

خۆزگە بەو رۆژە کە بەردەرکی ئـەتۆ سـایەم بـوو
ئەگەر گەدا بووم بەقەدەر شاهێ پـلە و پـایەم بـوو
کـاتی گـریانی شـەوێ چـەشنی مـناڵی گـرەزوک
دەنگی پرسۆزی ئـەتۆ هـەروەکـوو لای لایـەم بـوو
کاتی سەوداسەری چاو و دەمی سەداگەری رووت
بۆ بەهای خاکیبەری پێت هەموو دەس مایەم بـوو
بەزمی مۆسیقە لەنێو سینە چـساز و کـۆک بـوون
زەربی دڵ تەپل و گەروو چەشنی نەی و نایەم بوو
وەیکـە یـارەب چبـەهەشتێ بـوو لە چـاوما دونـیا
گۆی زەوی هەر وەکوو تۆپێکی گەمە و کایەم بـوو
تۆ نمونەی ئەدەبی شەرت و بـەڵێنیت «جـەغەتوو»
مــن نــموونەی پــتەوی کــێوی قـلیج قـایەم بوو
تۆکە دەتکـوت ئـەمە بـۆیەک ببین ئـاخر چدەبـێ؟
من تکەی ئاوی دوو چاو جوابـی بـەڵێ وایـەم بـوو
رۆژ لە ئـاسۆ کـەدەبوو ئـاوا لەبـۆ ژوانـی شــەوێ
کـــاتی بـــێتۆ لەژیـــاندا تـــەمەنی زایـــەم بـــوو
ئـــیستە پـــاییزی تـــەمەن هـات و گـوڵی بـرد بـۆیە
«خوزگە بەو رۆژە کە بەردەرکی ئەتۆ سایەم بوو»

سارۆ قامیش خاکەلێوەی ٦٨

کێ دەپرسێ چۆنە حاڵی شەونەخوونی خۆی لە چاو
کوا دەزانێ حاڵی تینوو، لاوی مەستی گوێی زناو
کەی دەسووتێنێ دڵی بۆ کۆتری بێباڵو پەڕ
شاتەواری شەورەوی وشیار و ژیری فێرە راو
من کە دایم عیشقی پاک و هەستی میللی رێگەمە
زەنگی بەدناویم زڕاوە و بوومە ریسوای چاوراو
با لە غوربەتدا بنێژم تەرمی ئاواتی لەمێژ
چونکە لەم دەورانە بۆ کورد گۆڕ غەریبی بۆتە باو
من کە پێم وابوو هەڵۆی سەر شاخی بەرزی پڕتەمم
تۆ بە حەڵقەی زوڵف و هەودای یەک نیگا خستمتە داو
لەم شەوی یەلدای ئەوینت من چلۆن رێ دەربەرم
کوا تریفەی بەر بەیان و تیشکی زێرینی هەتاو؟
وا ژیانم بۆتە گێژی مەینەتی و دەریای ئەلەم
فیکری لێوارم مەحاڵە و با دژە و کەشتی شکاو
ئەی مەسیحی لاشی مردووی پێکەنین و راپەڕین
تابەکەی چوار مێخی چەشنی باغی ژینم قاش کراو
هەستە بۆکەی دەی هەناسێک پاکی مردوون وەک بزە
هەرچی رێحانە و گوڵی شەوبۆیە توونین بۆ شەواو
گوڵ نەما، بولبول نەما، شوان وێڵە، مەڕ گەرمی شەوێن
قەستی بارشتی مەحاڵە، بۆ دەواش هەوری نەزاو
چیتە ئاسۆ، ئەو خەیاڵ و خەونە دیتت تێپەڕی
کوانێ ئەو غونچەی بەبای شیعرت دەبوو سینەی دڕاو

ورمێ ٥/ ١/ ٧١

له دەشــــتی بــێبنی عــیشقا دڵـم کــەرویشکی بــێلانه
له نـــەردی زەوقـی شـیعرم دا وشـەم کـوژراوی بـێخانه
مـــەلی تـینووی قـەراخـی بـەحری بێسامانی عـیشقێکم
هەتاکوو چاو هەتەر کا ئـاوه، ئـاویش سـوێره، رێ دوانـه
دەبێ یا چەشنی قـەقنەس گـڕ گـرم ئـاگـر لەخـۆ بـەردەم
وەیا بۆ وەسـڵی شـوڵەی شـەم نـەترسێم بـبمه پـەروانـه
بەڵێ! گـیانه! له ڕێـی عـەشقا هـەمیشه چـارەنووس وایـه
بگـاته عـەرشی ئـەعلا سـەر، له پـاشان چـاره سـووتانه
وەره ئەی بازی خۆش پەروازی دەشتی بێغەشی عیشقم
ئـــەسیری پـەنجەکـەی تـۆم لابـه وێنەی ژیـنی شـێرانـه
ئەمن ئـاوی نـەمامی عـیشقی تـۆم بـەو ئـاوی رووم داوه
ئـــەتۆش پـێت وایـــه مـن شـێتم ئـەوین وابـێ چهـاسانه!
بـــه سـاقی چـاوەکـەت بـێژه بـەسه خـاڵی نـەکـا دەفـرم
کـــەرەم کـا جـامی دیـداری وەکـوو ئـەو چـەپکه ڕێـحانه
ئـــەگـەر پـێتخۆشه حـاڵیبێ لەمـانای شـیعری دڵداری
له ئـــاوێنەی دڵـی خـۆترا له ئــاسۆ هـێندێ بـڕوانــه

پــەلکە ڕێـحانەش ئــەدی ئـەو بـۆنی جـارانـی نـیە
بــولبولی شـــەیدا نــەشەی کــاتی بــەهارانــی نـیە
وەی لەدەس ئەم چەرخە سپڵەی بێبەقا بۆ لەحزەێی
چــاوی دیــداری بــە هـەستی کـۆڕی یـارانـی نـیە
عاسمان هیندە چاو چنوک و ڕژدە بـۆ مـەزرای دڵـم
هــەر دەڵـێی ئـیمشەو خـەیاڵی تـاوی بـارانـی نـیە
گورگ و ڕێوی باغەوانـی بـاغی عـیشقن بـۆیە چـاو
غـیرەتی سـەیری نـیگای سـەوزەی هـەوارانـی نـیە
شــا هـەڵۆی ئـاواتـی شـیعرم لانـەواز و تـێکشکاو
بــــاڵی هـێلانەی کــەژی خـێڵی تـەوارانـــی نـــیە
لێمگەڕێن باڵـی پەڕی شـیعرم مـەبەستن شـاری دڵ
چووکە قـەت خـۆڕاگـری حـەملەی سـەوارانـی نـیە
چاوی شەوبۆ چاوەڕێی جـێژوانـی سـاتی شـەونمە
ئەم گوناحە قـەت جـەزای وێڵبوونی شـارانـی نـیە
نــایەوێ کــۆرپەی ئـەوینی خـۆی بـنێژێ زۆر زوە
بــۆیە ئــاسۆ مــەیلی کۆڕی سـەر مـەزارانـی نـیە
مهاباد ٣/٥/٧١

درەختی سەوزی ئاواتی ئەوینی من لەسەر راوە
بەهاری مەیلی تۆی دی وا وەکوو خەڵفێ هەڵیداوە
مەلی بِرسی نیگاکانم لە نێو شەوگاری زوڵفتدا
وەکوو هەستی ئەویندارییم لە سەد لا دەورەیان داوە
شەوەی زوڵف و بلوری سینە هەر ناڵێم قسەی چاوت
لە ئاگردانی سینەمدا گڕی لەم شێتە بەر داوە
چ تۆفانێکی پڕسامە لە رێی قیبلەی ئەوینمدا
کە منداڵی گرووی ماچی بە ناکامی سەری ناوە
بە تاڵی زولفەکەت بەستت گرێی پەیمانی پاکیمان
بە تاڵی بادە سوێند هێشتا لە گەردنمایە نەپساوە
وەهام لێ تێکەڵاوە رەمزی عیشق و هەستی دڵداری
لە دوونیای پاکی شیعرمدا دەڵێی، مەحشەرە هەڵستاوە
چ گوڵزارێکە پاکی و باسەفایی باغی روخسارت
دڵ و هۆش و پەیامی شیعری بردووم چم لەبۆ ماوە؟!
مەگەر تەرکی وەتەن کەم خۆت دەزانی شاعیری کوردم
ئەوینی خاکی کوردوستان لە رەگما بنجی داناوە
ئەمن چۆن هەر فیدای ئەو خاکە نابم وا لە قەلبی‌دا
وەکوو گوڵدانی خوا غونچەی کەسی وەک تۆ گوڵی داوە
عەزیزم چاوەکەی چاوم غەمی ریسوایی ئاسۆکەت
لە شاری تێپەڕی ئێستا خەریکە بچتە دنیاوە

بۆکان ٧١/٥/٢

تا لەژێر میحرابی ئەبرۆت نوێژەکەم دابەستوە
دەرکی لۆمەی خوێش و بێگانەم بە روومدا بەستوە
هیچ غەنیم و بەرهەڵەستی نایپسێنی رۆحەکەم
بەندی پەیمانی ئەوینتم چۆن لەدڵ وا بەستوە
هەر مەپرسن چۆنە ئەحوالم لە دووری سەوزەکەم
لەو دەمەیرا بۆژوان رێمیان لە دوو لا بەستوە
هێند سڕن مەیلی رەفیق و هاوەڵانی زۆر لەمێژ
ریچکە ئەسرینی هەوای یاریان لە چاوما بەستوە
من گەدای بەردەرکی شاهی عاتیفەم ئەمما ئەوان
رێی کەرەمیان بۆ گەدا حەتتی لە رووی شا بەستوە
دەی وەرە ئەی شاهبازی دەشتی عیشقی سادەیی
چۆن خودا بۆتۆ منی باڵو دەس و پا بەستوە
گوێ فەلەک پڕبوو لە نالەی بێکەسی من ئەی گەلۆ
گوێ هەواڵی یارەکەمیان چۆن بە خارا بەستوە
بۆ دەڵەی گەستووتە ئاسۆ لێوی ئاڵم؟ وا مەڵێ
با رەدیفیش تێکبچێ من لێوی تۆم کوا گەستوە؟

باغی گوڵستانی تەورێز ٧١/٥/٨

راست وچەپ و دەور و بەرم هەر گوڵە
هەرچــی دەبـینم لەهــەموو بــەر گــوڵە
بــاڵ نــەزەر کــەوتەوە ســەر هــەڵفڕین
جێی غەزەلی ئەم مەلە هەر ســەرگوڵە
بۆنی گــوڵەو دای لە دەمــاخی شــعوور
دایکی هەموو شیعری مــوعتتەر گــوڵە
چـــاو دەم‌و لێــو و بـــزە و نـــێو نــیگا
پەنجەرەی ئاسۆی دڵی رەهــبەر گــوڵە
وەک بــۆتە هــێندێک و بــڕێکێش دەوا
نەفخی مەسیح، سەنعەتی ئازەر گــوڵە
شەونمی سەرگوڵمی کچ و گەوهەرێک
چەشنی یەکن خاوەنی گــەوهەر گــوڵە
لالە و شـــــلێرە و شـــەوبۆ هـــەموو
دڵــبەرە جــاگــەر کــچە یــا گــەر گــوڵە
بۆ خەمی ئاسۆ لە ســەفەر یــا حــەزەر
ســووکە سـرنجی خــەمە لابــەر گــوڵە

بۆ بە جێتهێشت باغی دڵ هەر وەک بەهاری پارەکە
بێوەفا تـاوێ بـە چـاوێ چـاو لە ئـەم ئـەشعارەکـە
تا وەکوو تۆم بووی وەکوو گوڵـزار و باغی بوو ژیان
تـۆکـە رۆییت چـاو لە حـاڵی بـولبولی بـێچارەکـە
ژین وەکوو گـوڵزاری رێـبەندانـە گـوڵ پـەرپەر بـوە
سا لەبەر خـۆشت بـوە سـەیرێکی ئـەم گـوڵزارەکـە
تــا بــزانـــی چـون بـەهارێ بـووی لە زسـتانی مـنا
خۆت کەناسی جا بـەیەک خـەندەم پـتر پـەتیارەکـە
چاوەکەت گە مـەستە گـە بـیمارە دەڕوانـێ بـە تـیل
کەم دڵم سیلەی موژەی ئەم مەستە و ئەم بیمارەکـە
خۆم بەهوشیارێ دەزانی تاکوو مەستی تۆ نـەبووم
ئێستە مەستیم لا مەبەستە سەیری ئەم هوشیارەکە
هێندە مەستی عیشقی تۆم من بۆیە خەڵکی پێم دەڵێن
بــۆتە رێگـاپێوی رێــی دســتەی مــەلا ئـاوارەکـە
تۆ ئەوینی خۆشەویستی هـەروەکـوو خـاکی گـەلم
خـوا بکـا هـێندەم عـەمر بـێ بـێیەوە ئـەم جـارەکـە
خـــاوەنی مـوڵکی دڵم بـەو خـەتمی عـیشقم پـێبکە
بۆکتێبت جەرگی ئاسۆی خۆت بەجێی سی پـارەکـە

سەبزەوار ١٩/ ١٠/ ٦٨

گەردوون دەیەوێ ویستی دڵم کەمکەمەوە
لاوی کە ئەمانەت بوو لەلام بیدەمەوە
هەیهاتە لە ئەم ویستە کەبیستم دەیەوێ
ئاهەنگی مەلی دڵ لە گوڵم دوور خەمەوە
چاوم کە وەکوو حاجی لە دەوری قەد و چاو
دەخولایەوە ئێستا چوەتە ژێر تەمەوە
ئەو دڵ کە مەکۆی عیشق و ئەوین بوو جاران
وەک بەندی دەناڵێنێ بە قەمچی خەمەوە
سەرچی کەچی هەر مەرکەزی ئاواتی دڵە
دێوانەیە بە شوێنی هەواری شەمەوە
گوێم هێشتە لە گوێی دێ کزە گریانی بەدڵ
یای زینە دەناڵێنێ بەیادی مەمەوە
پیریمە گورەی دێ کەچی من هەر بەتەمام
جارێتر دەنگی ببیستم لە قەراخی چەمەوە
پێموایە گرەو بوو دەمی لاویم و ئەسەف
دۆراوە برا تازە چلۆن بیبەمەوە
جۆبار و چەم و دەشت و هەوار خواحافیز
لاموایە درەنگ دێمەوە یا نایەمەوە
دڵ تازە وەکوو هەورە لە ئاسۆ دەگری
با بڕژێ برا حەستەمە گەر لێی کەمەرە

سەبزەوار ٦٨/٧/٢٢

تۆ رۆژی هەوەڵ فەرمووت ئەم رێگەیە هەورازە
من گیری خەم و پێچی ئەم شوێنە ببوم تازە
تۆ ترسی هەڵۆ و باشوو چەشنی کەوی بوران پێچ
هێناتی و دەتزانی دەرکەی دڵەکەم وازە
دەتزانی کە هێلانەی بێتینی دڵی شاعیر
بەم سەخلەتیەش گەرمە راوگەی گەلی چاوبازە
سەد حەیفی کە نەتزانی لەم گێژی ئەوینەیدا
هەر قوژبنی قەلبی من حاشارگەیی سەد.رازە
جا چۆنی نەدرکێنم کوا حاڵی لە دڵ با بێ
بەحسی غەزەلی عیشقم کۆنە و بە مەست تازە
تۆ بازی گوڵی جوانم نیشتوویەتە سەرشانم
قەت پێم مەڵێ ئەم بازە گەر وازی لە پەروازە
سەد جارم ئەڕەنجێنی جارێکی دەپرسی لێم
گەر لوتفە وەها نابێ، گەر جەورە بە ئەندازە
هەر چەندە زڕی پیالەی عیشق و وەتەن و جوانی
وەک چەنگی دەسی زوهرە هەروا لە لەسەر ئاوازە
ئەی تیشکی گەلاوێژی شەوگاری رەش و تاریک
روونی کەوە «ئاسۆ» کەت کوا لایقە ئەو نازە

میراوا ٧١/٩/٥

لەش نەرم و رەزا سووک و دڵت رەق وەکوو بەردە
بـــــمدوێنە بــــزەت بـــێتێ دڵــــڕەقی بـــەردە
هــــێلانەیی پـــەرپووتی دڵـــە تـــاقی بــڕۆی تــۆ
رێـــی دڵ کـــە بـنیشێ کــە دڵم خـەستەیی دەردە
چین چینی دو زوڵفت لەسـەر ئـەو کـوڵمە گـەشانە
وەک لەشکری شـەو حـازری کـوشتار و نـەبەردە
لۆمەی کەس و کارم هەموو ماتوونە سـەر ئـەمرۆ
ســـا دەی‌وەرە لەم رازە ئـــەتۆ هـــەڵگرە پـــەردە
تــۆ تــینی گــڕی بـۆ مـنی دڵسـاردی جـەفاکێش
شــەرمێ مـەکـە گـر لەو دڵـە سـەرما زەدە بـەردە
لێوت وەکوو سەر پەلکی گـوڵە هـێند تـەڕ و تـۆرتە
هـــێندێکی بـبزوێنە شکســـتێ بــە شـــەکــەر دە
کــوا نــێرگسە تـــەشبیهی دوو چـاوت لە شـیعردا
نێرگس لە حەنای چـاوتە روو و رەنگـی کـە زەردە
دێـنێتە ســـەما تـــەیری ئـــەوین سـینەیی تـەختت
هەرچەن دڵەکەم کوشتەیە لەم شـەشدەری نـەردە
بـــزوێنی تـــەلی تـاری دڵـی تــۆ گــوڵی ئـاسۆی
بـــۆتۆ دەگـەڕێ تـیشکی نـیگام هـەر دەوە هـەردە

تەبیعەت جوان و رازاوەن چەمەن فەرشی گەلێ مەستە
جریوەی مەل لەسەر داران دەڵێن ئەی بێخەبەر هەستە
هەتا ئەم چەن خولەی‌ماوەی ژیانت ماوە مەستی‌کە
بە هوشیاری لەئەم دنیایە تێناگەی هەلی مەستە
چچاوەروایەنێکت هەن لە دونیایێ کە هەر وایە
ئەوەی زانایە مەحکوومی و ئەوەش وا حاکمە پەستە
هەزاران رەحمەتت لێبێ چبێ‌پەروا گوتت «هێمن»
ئەوا نەورۆزە دەی ساقی شەرابی شاعیریش خەستە
کەسێ سەرمەستی تاڵاوی ژیانی گەل نەبێ تو خودا
مەڵێن پێی شاعیری گەلیە مەڵێن پێی ژیرو دەروەستە
وڵات خەملێوە لەوڵاوەش هەرای ئازادیە لە گوێم
ئەوا نەشمیلەکەش رامە و دەڵەی چی بەدبەخت! بەستە!
لە ژێر سایەی قژی بیدا بە جامێ یادی نووریێکە
لە تاریکی شەوی بیرت نیگای ئەو شەوچرای دەستە
بەهارە و دێوی قەرزاری لەسەد لا دەورەیان داوم
بەڵام ئاسۆ گەلێ روونە مەترسێ کەڵبە ڕاوەستە

ورمێ ٧١/٢/٦

لێوڕێژە جامی سەبری دڵ ئەی مانگ و پەروینم وەرە
تاکەی بە هیوای وەسڵی تۆ ئەی ڕۆحی شیرینم وەرە
تۆ هێزی باڵ و دەستمی، شەوقی شەوانەی هەستمی
ڕێنوێنی ڕێی هەڵبەستمی ئەی ڕۆحی شیرینم وەرە
من بێکەسێکم کەس ئەتۆی من دیل و فریارەس ئەتۆی
چاومەس ئەتۆی چاوبەس ئەتۆی، ئەی ڕۆحی شیرینم وەرە
تاکەی غەمی دڵ کۆبەکۆ، ڕۆژ دەردی تۆ، شەودەردی تۆ
ڕۆژ کەم بە شەو، شەو کەم بە ڕۆ، ئەی ڕۆحی شیرینم وەرە
من شووشەیەک خاڵی لە مەی، تۆش بادەگێڕی بەزمی کەی
تۆونی بە جامت تا بەکەی ئەی ڕۆحی شیرینم وەرە
تاکەی شەمی دڵ بێ شەرەر، قرچەی خەبەر کا زیندەوەر
تۆش وا لە حاڵم بێخەبەر، ئەی ڕۆحی شیرینم وەرە
بێتۆ برای دەردم ئەمن، داری گەڵای زەردم ئەمن
بۆچی مەگەر بەردەم ئەمن، ئەی ڕۆحی شیرینم وەرە
تۆ شەمع و من پەروانەتم، تۆ شێخ و من دێوانەتم
تۆ ئەشقی من ئەفسانەتم، ئەی ڕۆحی شیرینم وەرە
من گێژی سیحری خەندەتم ئاسۆی خەمی سەد هیندەتم
تۆ ساحەبی من بەندەتم، ئەی ڕۆحی شیرینم وەرە

بۆکان ٦٧/٥/١٥

وێـــدەچێ شـــێبای ئـــەوینت بـۆدڵم نــەشنێتەوە
ئــەو گــرەی بـۆمت هـەبوو هـێدێکی کـەم بـووبێتەوە
خــۆ دڵــی مــن وەک هــەتیوی بـێپەنایە و بـێپەسێو
بەم شەوی زستانە بۆ کـوێی دەردەکـەی هـەر دێتەوە
عیشقی تۆهەر چـەشنی فـریزوو وا رەگـا ژۆی کـردوە
وەردێ کەی شێوی بـڕی بـێسوودە هــەر دەڕوێتەوە
هەر ئەتۆ بووی شـارەزای ئـەو کـووچە وێرانـەی دڵم
سەیرکە ئێستەش فەخرەکا دایم دایم بە شوێنی پێتەوە
تۆ شـەمی شەوگاری من بـووی چـۆنە شـەوقت لێبـڕا
من وەکـوو دێوانـە دەگـریم خـوایـە کـەی هـەڵبێتەوە
چـونکە جـێژوان چـۆڵە ئـەشکی چـاوەڕێییشم تکـا
کوانـێ پـەنجەی شـیعرەکـانت ئـەم تکـەی بسـڕێتەوە
تۆ وەکوو کانیاوی روون بووی بۆ دڵی تینووی غەریب
چــۆن دەبـێ لەو ئـاوە ئـاخر جـورعەیێ نـەخورێتەوە
نــامەرۆ، هــێشتا زوە لێم روونــە گــە بتبـینمەوە
تــاڵی پــەیمانی ئــەوینمان زوو گــرێ دەدرێتەوە
ژینی ئـاسۆ پـڕ گـرێیە و «ئـەحمەدە»[1] هـاوار دەکـا:
(گشت گــرێپووچکەی ژیـانم هــەر بـەتۆ دەکـرێتەوە)

بۆکان ٧١/٩/٢٥

١ - دوایین میسرەعی ئەم غەزەلە هی کاک ئەحمەدی مەولانیە

ای پیک تو از جانب من سوش سلامی
تا دشت خراسان برو زو آر پیامی
گو راحت جانم چه شده سوی من زار
هیچم نفرستی نه سلامی نه پیامی
ای کبک دری بهر خدا همچو گذشته
هنگام غروب از در مسجد بخرامی؟
دور از تو ره مسجد و میخانه ندانم
مشکل بگزارم که نمازی به تمامی
در سجده و نیت رخ زیبای تو پیدا
آخر تو بگویم چه رکوعی؟ چه قیامی؟
هر شب زتو صدها شبح آید به خیالم
سر گشته و حیران منم آخر تو کدامی؟
توصیف رخت را گه هجران نتوانم
گر طبع «رهی» دارم و گر نظم «نظامی»
عید آمد و مردم همه خوشحال و سعیدند
دور از تو افق را چه بود عید صیامی

ارومیه رمضان ۷۰

بولبولی شـەو حـەقیقەتی وا هـەر گـوڵی شـەوبۆی دەوێ
ئەو دەبێ مـەستی کـوتن بـێ کـوانـێ شـین و رۆی دەوێ
سـەد هـەزاران دڕکـی تـیژیشی لەبـن پـێ هـەڵچەقێ
چـاوی لێکنـانێ بـەڵێ ئـەو رێگـە هـاتوو چـۆی دەوێ
مـن دەزانـم گـوڵ دەڵـێ بـولبول وەرە بـێتۆ کـزم
گوڵ هەمووی دەدوێن بەڵام بۆ بیستنی گوێی خۆی دەوێ
راستە سەد قومری و قەنازی شێتی سەوزایـی و چـەمەن
بـولبولی بـێدڵ بـناڵە سـوورەگـوڵ هـەر تـۆی دەوێ
ئەی تروسکەی شەونمی شەوبۆی شەوانەی بێکەسیم
دەنگی قەل تەفرەت نـەدا قـەل هـەر گـوڵی بـۆژۆی دەوێ
تـۆ بـەقەت ئـەم نـیشتمانە دڵگـر و خـۆراگـری
خـۆت دەزانـی نـیشتمان کـوا زەمـزەمەی نـامۆی دەوێ
دار و بـەرد و کـێو و شـاخی نـیشتمانم تـا بـووە
عـاشقی ئـاوازی حـەیرانـە و هـەوای لالۆی دەوێ
دێـتە گـوێم دەنگـی لەتـیفی یـارە نـەشمیلانەکـەم
پـارچـە هـەڵبەستە بـڵاونەکراوەکـەی ئـاسۆی دەوێ

بۆکان هاوینی ٧١

وەکوو بابردەڵەی پاییزی جێگەم بایە دەیزانی
نەجێیی شک دەبەم تا دڵ لەوێ باری غەمی دانێ
بە دوکتۆر ناکرێ چارەی دەروونم هێندە پڕژانە
مەگەر خۆت ئەی حەکیمی حاڵزانم، زووکە، دەرمانێ
لەگەڵ پاییز گرەومان کرد لەسەر زەردی من و رووی ئەو
کە زەردی رەنگمی دی ئەو بە هەوری دایە بارانێ
لەگەڵ فرمێسکی دووری تۆی بە شەڕدا تا هەور چاوی
سپی بوو پێی نەما فرمێسک و چی نەکرا بە گریانێ
لەجاڕی عاسمان گڕ بەربوە ئەستێرە سووتانە
لەئەم سووتمانەشا دڵ مەیلی شا ئەستێرەکەی نانێ
لە سایەی تاقی ئەبرۆی تۆ لە جەمعی عاشقان تاق بووم
فیدای بەرزی ورەت بم من ئیشارەی چاوەکەت کوانێ
هەتا بەو یەک ئیشارەت ببمە ئاسۆی بەرزی دڵداران
دڵم پڕبێ لە فێنکایی تەمی پیرۆزی کوێستانێ

بۆکان ٧١/٦/٣١

چبکەم لەبەهارێ کە وەکوو پایزە کاری
کانی بە چمۆڵەی غەمەوە قەوزەیە باری
هەر دەشت و کەنارێ کە دەبینی لە وڵاتم
وەک پوورەیە پۆل پۆلی دڕندە و سەگە هاری
یا کاتێ لەگەڵ کۆڕێ لە هاواڵی دڵ و گیان
کۆ دەبیەوە دوور بی لە قڕە و هاژەی شاری
کێشانی هەناسەت کە کەمێ نەشئە بێجورمە
وەیوەی کە هەناسەش بۆتە ڕەمز و دیاری
بولبول لە پەنای بنجی گوڵی مات و خەمۆشە
ئەنگوستە دڕووی گوڵ لە مل و بینی وتاری
بۆی شین و گرین دێ، لە هەموو بەستە و دەنگێ
لێدەرکە ئەگەر جارێ بدا پەنجە لە تاری
گەر بێتوو کەمێ دەنگی خەیاڵت لەسەرێ بێ
قاچاخی دەبی یەکسەرە خۆت گورجی وەشاری
من ئێستە بڵێم چی لە بەهارێکی وەهادا
بولبول غەم و گریان بەرێ بۆ گوڵ بە دیاری
کورد ماتەم و غەمباری بەسەر ڕۆژی کشاوە
بۆی چۆڵی و بێگانەیە هەر دەشت و هەواری
ئاسۆی غەمی ئەو کوردە هەتا کەی نەڕەوێوا
تو بیت و خودا هەوری بزە هێندێ نەباری

ورمێ ٦٩/٢/٢١

بای شەماڵ لە کوێیە تاکوو ئەم پەیامەم بۆ بەرێ
چۆن لەزیندانی فیراقا وەختە رۆح و دڵدەرێ
پاییزم زۆر دیوە ئەمما قەت وەها دڵتەنگ نەبووم
پاییزێ رابوو لەمن یارەب لە هیچکەس نەگوزەرێ
سەد دەواتی چاو لەبن دێنێ قسەی خامەی مژۆڵ
کاغەزی دڵرەش بوە و سینەش ئەسەف بۆ دەفتەرێ
خەنجەری دووری نەبێ کەس جەرگی ئەسرین نابڕێ
بێبرووسکەی ئارەزوو هەوری خەفەتدا ناوەرێ
ژەنگی هێنا سیمی دڵ هێند ماتە نابزوێ بەهیچ
ناحەقی مەگرن کە نایێ لێی نەوای رۆحپەروەرێ
لەم وڵاتی غوربەتە هەرجێ دەچم نامۆیە بۆم
هیچ لە بۆم فەرقی نیە رۆژ و شەو و ژوورێ و دەرێ
ماڵی ئاوابێ لە غوربەتدا کە شۆخی دیدەمەست
نازەنینێ، چاو کەژاڵێ دیدەمەستێ ئەسمەرێ
روون دەکا کاولاشی چۆڵ و کۆنەلانی دڵ دەنا
تا ئەبەد ناکەم بەدی لەم شارەدا غەم لابەرێ
من دەزانم ئاسۆ لەم شارەش ئەوین خۆشەت دەکا
چی بڵێم بۆخۆی بەشی واداوە پێم رۆژی بەرێ

سەبزەوار ٢٣/٩/٦٨

شیوەن و شیعرم لەگەڵ خەم تێک بهاڵێن تا بەکەی
شیعری شادی بۆچی ون بوو مەبحەسی خوێن تا بەکەی
بۆ کرووز و زام و فرمێسک و خەم و تەم بەس نیە
پێکەنین و زەوق و ئاهەنگ کوانێ؟ لە کوێن تا بەکەی
ئەم وڵاتە پڕپڕی دەردە و منیش هەر دەدەدار
بانگی شیعر و دڵ بەجێی دەرمان دەخنکێن، تا بەکەی
باسی پەروانە و شەم و تیشک و هەتاوم بۆ نیە
بەیت و باڵۆرە و قسەی خۆش بوونەتە جوێن تا بەکەی
بۆچی کوفرە چاوی کاڵی رۆشنی باوێتە دڵ
بەم تەم و چارشێوە رووی وەک گوڵ بگیرێن تا بەکەی
بۆ هەتاو ئێستا لەپشتی هەوری رەش نایێتە دەر
عاسمانی شەو وەها تاریک و بێ‌سوێن تا بەکەی
پێکەنین قاچاخە شادی گۆڕغەریب جورمن ئەوین
ساقی و بادە و سوراحی باسی نەکرێن تا بەکەی
لاوی کورد ئازانە دەس‌دە خەنجەری زانینەکەت
زام بە جێی دەرمان هەموویان پڕپڕی خوێن تا بەکەی
شیعری ئاسۆ ئاگری نوێتان لە دڵدا هەڵدەکا
ئەی ئەوانەی بێ‌سەدان وامات و نەدوێن تا بەکەی

بۆکان ٦٩/٦/١٠

نە شەوم دەسرەوێ هەست و نەخەیاڵ لێ‌دەگەڕێ
نە هەتاوی خەمی تۆم تاوی لە دڵدا دەپەڕێ
هەمیسان دێمەوە داوێنی خەیاڵێکی تەنک
تاوەکوو دەربڕم ئەو هەستە بە لەشما دەگەڕێ
لەهەموو جۆگەلە خوێنی لەشی من دای و کەچی
شادەماری دڵەکەم دایمە لە دووریت دەپەڕێ
راستە زۆر حەستەمە ئێستا کە بە موو بەندە کەڵیش
هیچ مەترسێ بە یەقین تەختی ستەم وەردەگەڕێ
تۆ کچی پەلکە تەلاّیینی هەتاوی گوڵکەم
نیە باکم کە شەوی رەش لە گەڵمدا بە شەڕێ
بە قسەی قەوی هەرا گوی مەدە وەک با بێ لەلات
کورد لەمێژ ساڵە دەڵێ چوارپێ بە عاسمان دەوڕێ
تا دەبیستم کە لەتۆم مەنعی ئەویندارى دەکەن
پێکەنین دەمگرێ با چاوی رقم دەردەپەڕێ
تۆی کە ئاودێری دڵی ویشکمی بەو زەوقە تەڕەت
بێ‌خەیاڵت نیە لە کتێبی دڵم تاقە پەڕێ
گاو دراو هەموو جمگەی لەشی من چون بە ئەوین
رۆژ بە رۆژ دێت و پتر تێکەڵی رۆحە و دەجەڕێ
تۆی کەوا روون دەکەی ئاسۆی گەشی ئاواتی دڵم
تاکوو تۆم هەی لە ژیان بەردی هەڵەم نایەتە ڕێ

**ساروقامیش ٧١/١٢/٢٨**

خـــۆزگه دەتزانـــی کـه وەختێ گـڕی تـو دامگـرێ
چۆن دوو چاوم بە تکـەی سکڵی تـەڕم دەبـنە زرێ
مـنی کـاڵ بـەو گـڕی عـیشقەی تـۆ زریـنگاومەتەوە
خوایـە تـیندارتـری کـەی ئـەو گـڕە وا زوو نـەمرێ
بـە هـەڵۆی بـیری شـیعر راوی گـران دەکـرێ گـوڵم
تــەیری تــیژ بــاڵی خــەیاڵت کــە لە دڵ رادەبــرێ
تــاوەکــوو دێــتە یــادم مـن و تـۆ و ژوانـی چـەلان
حــەسرەتی ئــەودەمە ئـێستا لە دڵـم دەبـنە گـرێ
گەر بە سەودای سەر و ماچێ لە گـەڵم نـایە کـەوان
تــۆ گــرانــجانی لە ســەودایــە دەنـا زۆر دەکـرێ
هــەر بـە جـامی قسـە وامدێنیە جـەزبە و نـەشەوە
ســەدیەکـی نـایە لەدەس جـامی پـڕی کـیژی تـرێ
تۆ ئـەوێ رۆژی گـوتت هـەم گـوڵەوان بـەو بـولبول
وەک دەڵێن بەخششی ئەسحابی کەرەم زوو دەدرێ
غــەزەلی ئــاسۆ ئـەگــەر ئەورۆکـە مـن کـڕیاری
رۆژی دێ چــەشنی دیــاری لەبــۆ دڵــدار دەبــرێ

ورمێ ٧١/٩/٢٣

دەرمانی برینی دڵی بێچارە فەقەت تۆی          تۆ مەڵهەمی ئاسۆی

سووسەنبەرە و نەسرین و وەنەوشەو و گوڵی‌هێرۆی          لالەی لە دەمی جۆی

سووتاوە دڵی پڕکوڵی شاعیر بە گڕی رووت          نەک دڵ جگەریش سووت

بۆ زوڵفی رەشت کێیە نەسووتابێ وەکوو خۆی          سووتانم ئەتۆ هۆی

تۆ ئاسکی رەمۆکی کە لەنێو دەشتی وەفا نیت          بێ‌مەرزە جوانیت

هێند سرکی لەگەڵ تیشکی تەماشا و بزە نامۆی          نەک ئاسکی لەسەر خۆی

تۆ بەفری چیای کوردی وەیا پەلکی قەرەنفول          خوێنگەرمی لەبەر دڵ

لێم بوویتە هەوێنی غەمی دڵداری و دەش‌رۆی؟          تۆ تان و رەگ و پۆی

کۆرپەی گڕە زۆکی دڵەکەم وا لە گڕوو بۆت          هەر ژیرە بە لێمۆت

تو خوا وەکوو بووکێکی مناڵی وەرە شەو، بۆی          تۆ وەک گوڵی شەوبۆی

تۆ سێبەری سروەی سەحەری وەرزی بەهاری          تۆ مێشکی وتاری

تەشبیهی ئەتۆ هێندە گرانە وەکوو تاپۆی          هێند بەرزی دەڵەی کۆی

یادت بەشەوا لەرزە مچوڕکە تەب و تایە          کوا شەرتی وەفایە

بێ‌رەحمی وەبالی من و شیعرت بێتە ئەستۆی          دەک دەردی ئەوین خۆی

بەم حاڵەوە گەر ژانی ئەگەر ژینی ئەگەر تین          گەر خەندەی ئەگەر شین

دەرمانی برینی دڵی بێچارە فەقەت تۆی          تۆ، مەڵهەمی ئاسۆی

بۆکان ١٧/٢/٦٦

له گۆشه‌ی ماڵه چۆڵێکدا وه‌کوو تارێکی تۆزاوی
به ته‌نها هه‌ڵسپێرراوم به‌بێ رێزی به داماوی؟
هومێدی پەنجەی نەخشین بەدی ناکەم لەسەر سیمی
هه‌تا بگرێم به‌یانی که‌م مه‌قامی شیوه‌نی لاوی
مه‌لێکی لانه شێواوم نیه رێی هه‌ڵفڕینیشم
لەسەر لووتکەی چنارێکی وشکبووی زوڵمی بێ ئاوی
ئەوەی هەستی هەبێ نەم دی گەشروو و خۆش ڕوازی بێ
مەگەر ئەو شەخسە وابەستی لەکن مەردایەتی چاوی
لەنێو چاوی وەکوو دەریا بزەی لێو گەشەی شادی
له گێژی گێژه‌وی ده‌ردا له‌سه‌ر ئاون به خنکاوی
وه‌ره سه‌یری که شاری دڵ وڵاتێ چۆڵ و خامۆشه
مه‌گه‌ر تۆ به‌و بزه‌ی لێوت جم و جوولێکی تێ باوی
ئەتۆی ڕێبواری ئەم شارە ئەتۆی قیبلەی منی ئەمجارە
خەیاڵی خاوەکەم خۆش کە کە خێوی پەرچەمی خاوی
وەرە ئاسۆی خەیاڵی من، شەمی شەوگاری تاڵی من
مه‌گه‌ر عه‌شقت بله‌رزێنێ ته‌لی تارێکی تۆزاوی

بۆکان ٢٠/٥/٧٠

وردە بــــارانـــی پـــەڵەی پـــاییزی مـــەزرای دڵـمی
هـــــۆی پـــتەوبوونی ورە و قـــایمی هـــیوای دڵـمی
دەشتی دڵ چـەشنی وڵاتـم نـەبوو ئـاڵای لەوەپـێش
پـــەرچـــەمت ئـێستە دەڵـێ خـاوەنی مـەزرای دڵمی
گەر لە خزم و کەس و هـاواڵ لەسـەرت جـۆیبمەوە
رێـیـــــە دێـــتوومەتەوە قـــەیسم و لەیـــلای دڵـمی
شەفەقی سووری هومێدی و بزەکەت رەمزی بەهار
تـــەیری تـــیژباڵی ئـــەوینی و مـــەلی وریـــای دڵمی
دڵـی من مـاسییەکـی تـینوو و دوور ئـاو بـوو بـەڵام
ژیـــنی دووبـــارەت ئـــەتۆ دایـــەوە دەریـــای دڵـمی
شـەو هـەتا رۆژێ خـەیاڵت لەگـەڵم هـاودەمە چـون
دڵ گەدای کاخی‌یە خەو سـینەتە تـۆش شـای دڵمی
مـــن بـەتۆ خـۆشە دڵم لەم هـەموو ئـاوات و حـەزە
هـــاچەری قـــوفڵی هـــەزار خـــۆزگە و بـریای دڵمی
کـــێ دەڵـێ چـاوی ئـەتۆ چـەشنی گـەلاوێژە نـیگای
تاوی رۆشـنگەری ئـاسۆی شـەوی یـەلدای دڵـمی

بۆکان ١٨/٨/٧١

بە ئاهی شەو نەبێ کوورەی دەروونم پڕ سکڵ نابێ

شەماڵ قەتقەت حەریفی پای تەزووی زستانی دڵ نابێ

وەرە ئەی رۆحی ئەشعارم لە دڵدا بێرە دەرچونکا

دەر و دیواری تێک رووخاوە ئیدی بۆ مەزڵ نابێ

هەتا نەدرێ شەتەک باڵ و ملی شیعرم بەتای زوڵفێ

دەری ئەم کاولە وێرانە لە تێروانین، قوفڵ نابێ

لەنێو گوڵدانی شیعرمدا درووی غەم بنجی داکێشا

کە سروەی پێکەنینی گوڵ بە تۆزی پێی چقڵ نابێ

وەکوو بەندی کەمەندێ وام هەتا جووڵامەوە توند بوو

بەڵێ داوی ئەوین قەت بۆو پسان و بۆ هەوڵ نابێ

گوڵێ گەر پەڕپەڕ و ویشکی هەناسەی ساردی زستانە

بە ئاوی زەمزەم و نەفخی مەسیحاش قەت بە گوڵ نابێ

دڵی عاشق هەمووی ئاسۆ بە وێنەی مەنجەڵی عیشقە

بەڵام هیچ مەنجەڵی عیشقی وەکی تۆ پڕ لەکوڵ نابێ

**بۆکان پاییزی ٩٧**

غـەمزەدەی عـیشقم بـزەی شـیرینی سـەر لێـوم دەوێ
مـــەیزەدەی دەردم شـــەرابـێ سـینە پـالێوم دەوێ
خۆ ئەمن نـەی نـیم کـە سـینەموا لەچـەن لا کـون بـوە
بـــۆ بــەیانی دەردی دڵ ئـــاە زۆرە مـــن لێـوم دەوێ
مـــن کـــزی دەردێکـی بـێدەرمانم و ئـێستەش رەقـیب
بـێوچان لۆمـــەم دەکـا پـێیوایـــە مـــن نـێوم دەوێ
حـەسرەتی نـێو بـاغی سینە و نـار و بـێوشکم دەکـا
بـــولبولی بـــاغی ئــەویندارم گــوڵی سـێوم دەوێ
یـــادی لەیـــلای دڵ وەهـــای بـێزار و غـەمگین کـردوم
هــەر وەکـوو مـەجنوون لە گـەڵ بـێزارم و کـێوم دەوێ
ئارەزوومە بێشەکێنێ بـــا، گـوڵی رووی کـیژی کـورد
کوانێ رووی بێشەوقی بن رووبەند و چارشێوم دەوێ
دەســـتی نـێوباغەڵ لە ئـەستۆم دایـە بـێتین و گـورم
بەسمە گەردوون لێمگەرێ کوا دەستی قورپێوم دەوێ
تـــۆ ئـــەگـــەر راوچـــی وڵاتـــی دیـــدەمەستانی وەرە
مـــن بـــە دڵ کـــوژراوی بـژۆڵێ دڵـەنگێوم دەوێ
خێوی شەوگاری رەشی ئەم خـاکـە ئـاسۆی تـار کـرد
بـــۆیە تـا هـــەم بـولبولی بـاغێکی بـێخێوم دەوێ

بۆکان پاییزی ٦٨

زۆر پــــەریشانم هــــەوایــی نــەشئە بــزوێنم دەوێ
هــــێندە تــوونیم بــادەیێکی کــەڵلە جــۆشێنم دەوێ
بــۆ گــڕووی تــفلّی دڵی پـڕحەسرەت و بێنازەکـەم
دوو شــەمامەی شـلک و سـاوای سـینە تـاسێنم دەوێ
قــاقڕە دەشــتی خــەیاڵ و بــاغی هــیوا بــێسەمەر
داری تــــووبا قـــەرزە ئـێستا داری بــەرهێنم دەوێ
هــێند ڕژا خــوێنی دڵــی شــیعرم لەتـاوی بێکـەسی
مـــن لە خـــوێنبێزارم و کــوڵمێکی پـڕخوێنم دەوێ
هـــەورە گــرمەی عـاسمانی غـەم گـەلێ بـاری بـەسە
چـــەن پـەڵەی هـەوری بـەهاری خــەندە بـارێنم دەوێ
ســـەرکەژی ئـاواتـــی لاویـــم بــەفری غـەم دایگـرتوە
هــــاژەهاژی بــــای شــــەماڵی بـــەفرە تــاوێنم دەوێ
بەسمە ئیدی جەزرەبەی دوو دەستەگی و لێکهـەڵبڕان
کـــۆمەڵێکی یـــەکـدەس و دڵـپاک و خـــاوێنم دەوێ
بــووکی ئــازادیـیم دەوێ دەسـتم لەمـل کـا و بـێتەلام
کــوا ســـەری شـۆڕ و مـلی بێواز و بـە کـوێنم دەوێ
بای شەماڵ بەژنی کـچی شـیعری لە ئـاسۆ ڕاوەشـاند
بـۆیە مـن شـیعرێکی تـەڕ وەک شـووڵی لاوێـنم دەوێ

سقز ١/٥/٧٠

## لەسەر پردی تازە

چۆم وەک مارێکی ئەنگاوتە بێوچان ڕێگا دەپێوێ
شەپۆڵ وێنەی خەیاڵی من جارجار سەری لێ دەشێوێ

تاو هێند بەتین و تەوژمە خوێن لەرەگدا دێنێتە جۆش
قەڵپەزەی ئاو گرمەی جارجار بەڵگەی زیندوی شاری خامۆش

داری خەواڵووی پاش زستان بێجووڵە و شنە تاساون
دەڵێی بۆ سوجدە بۆ بەهار لە قنووتا ڕاوەستاون

پردی تازە درێژ، درێژ بەسەر ماری چۆم کشاوە
سەدان ناو و بیرەوەری لەنێو دڵی حەشارداوە

من و خەیاڵ و هەڵبەستیش خەریک سێ کوچکێنی بیرین
غەرقین لەنێوان هەزاران بیرەوەری تاڵ و شیرین

خەیاڵ دەبێتە باڵداریک دەفرێ بو ئاو ودانەکەی
بۆ خۆراکی شیعرێ تازە بەجێ دێڵێ هێلانەکەی

ئەمن دەبمە پارێزەری و بسکی تۆش دەبێتە باڵی
ئەم بێچارەی بێهیوایە چبکا لە هێلانەی خاڵی

جارجار خشە و هاژەی ماشێن دەپسێنێ هەودای ئەندێشەم
منیش بەخۆم دەڵێم گەلۆ چمداوە لەم قرە و کێشەم

بۆ نەچمەوە نێو خەیاڵی دنیای دەروون و هەستی خۆم
بۆیە هاتووم تا تێکەڵبم لەگەڵ شەپۆل و ڕۆحی چۆم

بەرەو شاری دەریا بڕۆم    جێبێڵم قاقری و خامۆش
خەیاڵ وەپێشم کەوتوەو    بانگم لێدەکا وەرە تۆش

تاکەی لە کێبەرکێی پارە و    پلە و مەقام داناکەوین
تاکەی ئەوین حەپسی دڵبێ    ژین چیە مانای بێئەوین؟

خۆزگە ڕۆژێ لەم جیهانە    بیر دەگەییە ئەو رادەیە
ژین ئەگەر مانای خواردنە    ژینی حەیوان چەن سادەیە

ئەی چاو؟ ئەی ئەستێرە؟ ئەی شەو؟    ئەی دار؟ ئەی گەڵا؟ ئەی روبار؟
ئەی ئەوین؟ ئەی سرتە؟ ئەی کچ؟    ئەی ژوان؟ ئەی هاوراز؟ ئەی دڵدار؟

ئەی نیشتمان؟ ئەی هەژاران؟    ئەی فرمێسکی چاوی هەتیو
ئەی من تێربم چۆن لەبیر چێ    کۆرپەی سەرشەقام بێبژیو؟

ئەی مۆسیقا؟ ئەی گۆرانی؟    ئەی چێژی بادەی عیرفانی؟
ئەی شەرابی راستی و شادی؟    ئەی سەرچۆپی ئەی گاوانی؟

ئەمانە هەموو بێهودەن؟    وابێ، ژین چەن بێمانایە
هەرچەن جوابی هەرپرسیارێ    وشەی کورتی "ئا" یا "نا" یە

بەڵام جوابی ئەمپرسیارە    نە بە "ئا" یە و خو "نا"ش نیە
ژین و ئەوین ئاردی ڕۆحن    یەقین ئەم دنیاش ئاش نیە

دنیا ماڵی سەفای ڕۆحە، ژیان بەیتی ئازادیە
تەمەن خەونێکی ئاڵۆزە، پڕپڕ لە ڕەنج و شادیە

بۆکان ٣/١٢/٧١

# ئازیزم نەکەی...

بەیانی کاتێ میلی تیشکی تاو دەرێژێ چاوی ئاسۆی خەواڵوو
تینی یادی تۆ دەزێتە هێزم دێم بەرەو شار و وڵات و ماڵوو

❁❁❁

لەسەر زێرینە زینی ئەسپی خۆر دەفرم بەرەو لات بە وێنەی شەماڵ
دەروون وەک جامی بلووری تاسەم ئازیزم نەکەی دەرکەوی لە ماڵ

❁❁❁

ئازیزم نەکەی خۆی تیا نەنوێنی دەنا نابیتە پەری شیعری جوان
چۆڵ دەبێ شاری خەیاڵ و هەستم شەوق دەڵێ ئەیزەوق کوا جریوەت کوان؟

❁❁❁

ئازیزم نەکەی هەڵقرچێنی شاباڵی سووری پەپوولەی تاسەم
نەکەی لێم ونبی دەنا دەشکێنم بە گوللەی شیعرێ شەقڵی ئەم باسەم

❁❁❁

بەیانی هێشتا تیشکی تاوی روون گەرمی نەکرد بوو کولمی خورەتاو
من گەیمە شاری ئەوین و تاسەت کردمە شوێنگێرت کۆنە راوچی چاو

❁❁❁

لەسەر بەرماڵی شێعرە تازەکەم دەس بە دوعا مام بۆ شوێنەوارێک
کام شوێنما نەچم؟ کێما نەپرسم؟ جێژوانیش ببوە کۆنە هەوارێک

❁❁❁

شوێنی پێی یادی حەز و تاسەمان لەسەر خۆڵی نێو جێژوان جێمابوو
خۆزگەم بەوساتە لەسۆزی شیعرێ مەولەویش حاڵی وەکمە شێوا بوو

شـل بـوو ئـاوزەنگی خـەیاڵ و نـەمدیت	شـــنەی لێ بــــڕا هــەناسەی شـــەماڵ
ئــازیز لەکــوێ بــووی بــۆ نــەهاتیەوە	چـــەن چـۆڵ بـوو بێ‌تۆ هـێلانەی بـەتاڵ

✿✿✿

خــۆزگە دەمزانـــی کــوێت کـردە بـەهار	بـــە ســـــەوزەڵانی بـیر و هـــەناسەت
کــام مــاڵت کــردە گــوڵخانەی خـــەیاڵ	کــام شـەقام فـەخری کـرد بـە پیاسەت

✿✿✿

خــۆزگە هــەر ســاتێ چـاوی ئـاواتــم	لە دوورتــرین شــوێن بــەدی دەکــردی
ئـــەوسا دەتزانـــی چـۆن هـەڵۆی چـاوم	بـــەرەو بـــارەگـــای شــیعری دەبــردی

گیانە لێت روون بێ، تا ئەسپی خۆر بی، دەمخاتە پشتی و دێم بۆیەک هەواڵ
بـەڵام ئەمجـارە گـەر هاتو هاتم، ئازیزم نەکـــەی دەرکـــەوی لـــە ماڵ

تازەقەڵا ٢١/٤/٧١

# ئازاری شەو

دنەی هەستێ ئاگراوی  چاویان لەگەڵ خەو کردم زیز
چارشێوی رەشی پۆشیوە  بالای بەرزی شەوی پاییز

گوڕەی شەوبای شەوگاری رەش  راپێچەکی دام بۆ دەرێ
لەم شەوگارە رەشەی پاییز  روو لەکوێکەم چموەسەرێ؟

خشەی گەڵای وەریوی دار  برا لەژێر پێی رێبواران
شەقام چۆڵ و هۆڵ و کپە  با، جێ‌خۆش دەکا بۆ باران

زرقە و برقەی کارەبای شار  چاوی شیعری شەوارە خست
ئەژنۆی شل بووی شەوارەی شەو  شەقام دەپێوێ بست بە بست

ماسی تینووی هەست و خەیاڵ  لە دەریای شەو کەوتە مەلە
لاقی ماندوی رێبواری زیز  بە ماندوییش کەوتە مەلە

لە دوور دەنگێ نەرم و لاواز  هاتە گوێچکەی رێبواری شەو
وەکوو پڕمەی گریانێ بوو  لەتاو تێوی ئازاری شەو

راستە گریە و ئازاری شەو  خەو رەوینی دەردەدارە
بەڵام زۆرکەس گریە و غەمیان  وەک شەو لە مل بەپێ‌وارە

ئاخ چەن سەخت و چەن پڕئێشە  شەرمی بێ‌ئینسان لە دەردی
نەوێرێ ئاشکرا بگری  قووتی‌دا هەناسەی سەردی

سەختە گەرووی هاوار ببڕن     لەمپەریشت سست و بێهێز
ئیدی چۆن نەگریم بە خەیاڵ     بووکی ژان نەگرمە ئامێز

***

بڵێی گریان دەنگ دانەوەی     زرینگەی تاسی خەیاڵ بێ؟
یا راستەقینەی پڕژاری     کەسێک لەدەست ژینی تاڵ بێ؟

***

کە وابوو گریان هاوارە     لە زەلکاوی ژینی نزمی
گازی گەرووی ژێر چەپۆکە     لەدەس خۆیی و گەل و خزمی

***

گریان خۆزگە و بریایە بۆ     شەوبێدارانی دڵ بەسۆ
سەدان خۆزگە و سەدان بریان     نەک هەر هیخۆی هی من هیتۆ

***

خۆزگە لە قامووسی ژینا     وشەی لەیەک نەچوون دەمرد
رقی خودای هەستاندایە     کڕنۆش بردن بۆ خوای دەسکرد

***

گەڵای وەریوی دەسخەزان     وشک نەبوایە تا بەهار
زیندوو بوونەوەی دیبایە     بەچاوی خۆی نەک زۆر یەکجار

***

ئەوچاوانەی تا دواپشوو     لێڵی نیگای چاوێ مەستن
روونی روانینی یار دەبوون     با کەم بڵێن چاو لەدەستن

***

خۆزگە سەد خۆزگە ئاسۆی ژین     لە رووی شەوی بسڕایە ژەنگ
کوڵکەزێڕینەی حەورەنگی     ببوایەتەوە بەیەک رەنگ

***

ئیدی نە شەو دەبوە شەوە     نە شاعیر دەبوە خەیاڵی
پەری وشەی راست و رەوان     بەسەر شیعرا دەکشا باڵی

تاران ١٨/٧/٦١

## باران

لە چوارگۆشەی عاسمانەوە     هەوری ئاوسی رەش نەوی
لە ترسی قەمچی تریشقە     نوتفەی دەزێتە سەر زەوی

❁❁❁

عاسمان و عەرز تێکەڵ بوون     بووکی خۆر ون و نادیار
سووک بە شووشەی پەنجێرەدا     باران تکتک دەتکێتە خوار

❁❁❁

پاییزی زەرد رەش هەڵگەڕا     تا چاو هەتەرکا هەر رەشە
زەوی تینووی بەتاو سووتاو     بەم بارانە دێتە کەشە

❁❁❁

دەڕژێ باران دەتکێتە بن     بڕکەی وشک بووی دەس کەڵە
رەگی تەڕی ریشەی سیسی     تێراو دەکا حەقە پەڵە

❁❁❁

پاساری لە جیکەجیک کەوت     بە بێفڕە و فڕتە دڵتەنگ
لە ژێر بەرهەیوان و پاسار     هەڵکورمان کڕ و بێدەنگ

❁❁❁

گەڵای داران تەڕ و بێهێز     سەوز و سوور و زەرد و بێتین
لە گەڵ هەر دەنکێ بارانە     ناکام دەکەونە هەڵوەرین

❁❁❁

تو خوا هەوری پەڵەی پاییز     تێراو کەچی شار و گوندە
لەمێژە لێوی ئەم خاکە     تینووی بارانێکی توندە

❁❁❁

پەڵەی پاییز جوانە ئاسۆ     حەیف دەوەرێنێ گەڵای دار
بەڵام چون من عاشقی چرۆم     شتی ترە پەڵەی بەهار

بۆکان رەزبەری ٧٠

# وێنەگر

نـــازانـــم چـــۆنت بـــۆبدوێم	لە جـــوابـــی ئـــەو تـــەماشایەت
تـــۆ شـــۆڕەبی و مـــنیش مـــاندوو	کـــوا ئـــەورێیەم بـــێمە ســـایەت!

❁❁❁

کـــراســـی شـــیعر و لەچکی وشـــە	بـــۆ جـــلی بـــووکی خـــەیاڵت
هـــێندە بـــەرتەنگن وەک زارت	نـــاکـــەن تـــەوسیفی جـــەماڵت

❁❁❁

تـــۆ بـــە لەچکـەی شـەدەی ڕەشت	مـــن بـــە بـــەختی ڕەش و تـــاریک
دوو ســـــیابەش نـــیگانیان	گـــرێ دران بـــاریک، بـــاریک

❁❁❁

چـــاوەکـــانت کـــانگای نـــوورن	لەنـــێو شـــەوی ڕەشـــی ژیـــنم
تـــۆ پـــەری شـــیعری و نـــەمزانـــی	هـــاتیە بـــەهەشتی ئـــەوینم

❁❁❁

تـــۆ نـــیگارکێشێکی کـــوردی	بـــە ڕەنگ و پـــێنووسی تـــووکن
بـــە یـــەک نـــیگا خـــۆت کـــێشاوە	لەســـەر کـــاغەزی دڵـــی مـــن

❁❁❁

شەرمێ مەکە، شەرمێ مەکە وەرە با تێر لێک بڕوانین
هەر ئەوەنـــدە یەک دەبینـــین هەتاکوو لـــێرە میوانین

مەریوان ٧٢/١١/١٩

# "بەرخ"

چەنجوان چەن نەشمیل دەرۆیی ‌ ‌ ‌ چەن خوێنشیرین چەن سەحەت سووک
بێخەم بێخەیاڵ چدڵخۆش ‌ ‌ ‌ سووک و ئازا وێنەی هەلووک

❁❁❁

رەزا سووک و لەبەر دڵان ‌ ‌ ‌ لەپەنای دایکی رەنجەڕۆی
بەرخۆلەیێکی قەشمەرە ‌ ‌ ‌ هێند جوان نەبوو جوانتر لە خۆی

❁❁❁

هەنگاوەکانی چەن بە گوڕ ‌ ‌ ‌ دووگی جوان و چووک و گۆشتن
بێخەبەر بێخەیاڵ خۆشحاڵ ‌ ‌ ‌ بەرە و سێدارەی فرۆشتن

❁❁❁

سەر لەبەیانێکی رۆشن ‌ ‌ ‌ وێنەی بەهاری ئازادی
هەوا بۆنی باران و خۆر ‌ ‌ ‌ دژی زستان و بێدادی

❁❁❁

سپی و رەش و چاوی کەژاڵ ‌ ‌ ‌ چەن بە تامەزرۆ دەنوارێ
لە پەنای دایکی رەنجەڕۆی ‌ ‌ ‌ بەرەو جێژوانی بازاری

❁❁❁

تۆ چووزانی بۆ کوێت دەبەن ‌ ‌ ‌ وا خوێن شیرین هەڵدەبەزی
خۆت لەم و لەو هەڵدەساوی ‌ ‌ ‌ سەر گوڵی ئاوات دەگەزی

❁❁❁

بۆی بەهار سەرخۆشی کردووی ‌ ‌ ‌ نەشە، وریا، زیت و قەشەنگ
جوانتر لە هەر بەچکەی گیاندار ‌ ‌ ‌ بێترس، بێخەیاڵ، بێدەنگ

❁❁❁

هـــو! بـەرخـۆڵەم هـەروا خـۆش‌بە  خـــۆ چـــەقۆی قـەسساب نـاناسی
خـــــۆ ســـــێدارەی فـــرۆشتنیش  نــــەت‌دیوە و نـــاش‌زانـــی بـــاسی

❁❁❁

کـــۆزە خـــنجیلانەکـەی خـــۆت  گـــەورەترین شـــاری ژیـــن بـــوو
هـــەزار خـــۆزگەت بـــەوساتەکـــا  ئـــەوێ بـــەهەشتی ئـــەوین بـــوو

❁❁❁

خـــۆزگە بـــەخۆت کـــە نـــازانـــی  بـــەرەو کـــوێت دەبـــاخاوەنەکـەت
چهــــــەوایـــــیکت بـــــۆ دەڵـــــێ  لەســــــەر شــــــایی و زەمــــــاوەنت

❁❁❁

ئـــەو ئـــاهەنگەی بـــۆت دەگـــێڕێ  هـــەوای شـــین و رەنـــج و مـــەرگە
بـــــزەی شـــــەڕ خـــــێزی ژیـــانە  شــــــەری ژیـــن و نـــان و بـــەرگە

❁❁❁

هـــۆهۆ بـــەرخـــۆڵە جـــوانـــەکـەم  گـــــەر مـــن بـــایەم لەجـــێی ئـــێوە
حــــــەرامــــــم دەکــــــردن لەخـــــۆم  نـــــان و ئـــاوی هـــــەرچـــی خـــێوە

❁❁❁

خـــــێوێ حـــەزکا بـــە کـــوژرانـــم  لە بـــــــەرانــــبەر هـــــێندێ دراو
خـــۆزگە ســـەد خـــۆزگە هـــەر نـــەبن  دانـــــەیەکـــیان بـــۆ زەیـــنی چـــاو

❁❁❁

گـــــەر مـــن بـــایەم لەجـــێی ئـــێوە  رووم دەکـــــــردە ئـــــــەو کـــێوانـــە
لەوێ و ژیــــــنی ئــــــازایــــــەتی  دوور لە چـــــاوی چـــــی ئـــینسانە

❁❁❁

سـەربـەرز ئازا نەبەز وریـا دوور لـە چاوی هەرچی خێوە
بەرخۆڵەم بڕوام پێ‌دەکەی ژینی سەربەست هەر لە کێوە؟

ورمێ ٣/١٢/٧٠

# یادی بەخێر

یادی بەخێر سڵاوەکان
یادی بەخێر زەردەخەنە
یادی بەخێر کۆڕی شەو و شەوگەڕی ماڵ
شەوگەڕی وا شەو چەڵەکەی،
یەکیەتی بوو عیشق و سەفا و پرس و هەواڵ

❀❀❀

کاتێ کە ئێوارە دەهات
پلووسکە دارە کانیەکەی زوڵاڵی دێ
پێدەکەنی بەڕووی پەریزادی گوڵخەندەی رانی رەوت و روو خاسەکەوێ
گۆزەکە پڕ دەبوو لە گوڵ
تامی دەبوو تێکەڵی بۆنی خۆشی گوڵئاوی شەوێ

❀❀❀

یادی بەخێر سڵاوەکان
یادی بەخێر مانگەشەوی شەوانی دێ
ئەو گەڕەلاوژەی کوڕە حەیران و جەمات
لەپشتی پەنجەرەی رەش و دەلاقەوە
دەنگی هەنیسک و یا چپەی یارێ دەهات
مانک دەتکایە سەر زەوی عارەقەکەی
تکەی گەشی چاوی شەوانی ساوی دێ
تریفەکەی مانگەشەوی دەکردە شەونمی گەشی
روومەتی بووکی نابەدڵ

یادی بەخێر
یادی بەخێر مێخەک و ملوێنکی سملّ
کەوتە چقەڵپەزەی بەسامی بەحرەوە تیشکی ئەوین
بەحری هەوا؟
بەحری هەوەس؟
بەحری تەمەددونی درۆ و بۆمب و چەک و خوێن و برین
بەحری هەژاری خەڵکی دێ
بەحری بێزاری خەڵکی شار
یادی بەخێر عیشق و ئەوین
ئەوینی مەم
ئەوینی زین!!

✿✿✿

ئێستە بەئاهەنگی شنەی بای خەمی دێ
ریزەچناری سەرە ریێ ژوانی چەلان دێتە لەرین
ئێستە بەئاوی چاوی سوورە گوڵ
لق‌لقی چاوی نێرگسی مێرگی ئەوین دێتە گرین
یادی بەخێر داوەتی گوڵ
یادی بەخێر لێوی عەقیقی یارەکەم
چەشنی سکڵ
بەزەردەکەی مەنجەڵی دڵ دەهاتە کوڵ
یادی بەخێر سڵاوەکان
یادی بەخێر جەژنە شەو و
شۆردنی مەنجەڵ و سەلە و
بۆنی
هەرەشتە تێکەڵی چێشتی سپی، پڵاوەکان
یادی بەخێر سڵاوەکان

بەڵام بەچاوی کاڵی تۆ قەسەم هەوێنی شیعرە تازەکەم
بە بۆنی زوڵفی تۆ قەسەم ئەوینە پڕ لەرازەکەم
ڕۆژێ دەبێ،
بە خوێنی ئامۆزای خەجێ
دەبێتە دەشتی سوورە گوڵ
هەموو چڕ و لێڕ و بەڕوو و دارە بەنە
دەزێتە لێوی شار و دێ
تیشکی بزە و زەردەخەنە
دەزێتە لێوی شار و دێ
تیشکی بزە و زەردە خەنە

بۆکان بەفرانباری ٧١

# کوا بەستەڵەکە

کێ دەڵێ بەستەڵەک و بادەوەیە
کێ دەڵێ گاڵەدرا دەرکی هەتاو
قوڕ بەسەر خێڵی سەهۆڵ
بەدبەخت ئەو کەسە دڵخۆشیەکەی بەو شەوەیە

❁❁❁

من لە ئاهەنگی شەتاوان حاڵیم
من لەسەر بەندی هەوای شووشە شکاوان حاڵیم
باش دەناسم لە سەدان فرسەقەوە دەنگی دەهۆڵ
قوڕ بەسەر خێڵی سەهۆڵ

❁❁❁

دێتە گوێم دەنگی گەرووی خاسەکەوان
تێدەگەم من لە وشەی باڵی هەڵۆی سەر کاوان
هەست دەکەم سامی وەرەی بەرزی فڕین
لە خشەی زەردە گەڵای مانگی خەزەڵوەر حاڵیم
تێدەگەم رەمزی گوڵ و بولبولی سەرمەستی بەهار
دێتە گوێم دەنگی تروسکەی گەشە ئەستێرە لە جەرگەی شەوی تار

❁❁❁

من گەلێ جار لە گەڵ ئەو بولبولەدا گریاوم
کە گوڵی سووری لەبەر شەختە وەری
دڵم بۆ غونچەگوڵەی زۆر بوە تەنگ
کە نەپشکووت و زوقم نیشتە سەری
کەچی بەم حاڵەوە هەر سەوزە سەرم
من لە کاجێ کە لەبەر بەفری سپیدا سەوزە
فێر بووم چۆن بە سەهۆڵ پێ بکەنم
دڵم هەر گەرمە ئەگەرچی لەوە زۆرتر کز و سڕ بێ بەدەنم

❁❁❁

وەنەبێ پیرێ گەڕیدەش بم ئەمن
منی ئازاری هەژاری چەشتوو
لە کەلیخانی ئەویندا ماندوو
نە لە ئەم ڕێگە بە ئەزموون و پتەو
چ بکەم ئەم خاکە وەهای بار هێنام
تا یەکەم خورپە لە جێژوانی ئەوین کەوتە دڵم
تاکوو زانیم کە چەنێ دەس بە سەرین خۆم و گوڵم
لە دڵم داگرێ نێڵەی وەکوو ئاتەشکەدەیە
تاکوو ئەم ئاگرە پیرۆزە لە دڵما دەگڕێ
تاکوو ئەو تینی هەیە
پێکەنین دەمگرێ بەو خەڵکە دەڵێن
سارده با و بەستەڵەک و بادەوەیە

بۆکان ١٠/٩/٧١

## شیعر

ئازیزەکەم تۆ خۆت شیعری
شیعری گەرووی شاعیرێکی چاو بەستراو
تۆ فریشتەی
یان شیعری فریشتەی خودای لە ئاسمانی شاخی هەورامان‌دا نوسراو
نا! نا! گوڵم
تۆ جوانترین شیعری سپی هەوارامانی
تۆ جوانترین شاغەزەلی شاعیرێکی ئەویناری کوردستانی
بەڵام گیانە خۆت نازانی تۆ خۆت شیعری
شیعری جوانی مەریوانی

مەریوان ٧١/١١/٢١

## هەور

دەڵێن پەڵەهەورێکی دوور
قەرارە بێ و لەسەر لێوی کانیلەکان
بسرێتەوە کەفی قەوزە
من بارانی وام نەدیوە
هەور دوورە و
شینکەی ئەم خاکە هەر سەوزە

بۆکان ٧١/١/٢٤

## "بۆنی بەهار"

کاتێ بەهار
بە تیشکی گەرمی خۆرەتاو
لە چاڵ و بەرزی کێوەکان
خێوەتی زێڕی هەڵدەدا،
شنەی شەماڵ
قژی کچی داری بەهار
هەر وەک خەیاتە بادەدا،
دەکرێ بڵێی وەرزی ئەوینە کات و سات
مەلان بە تیپ و فەوج و گەل
وێکڕا دەڵێن بەهارە دێ،
کوێربم لەنێو ئەم خاکەدا بۆنی بەهار
لەگەڵ بۆنی شەڕ و خەم و ئازارە دێ
تۆبی خودا دە پێم بڵێن
ئەوەش بۆنی بەهاری دێ؟

بۆکان ٧١/١/٢٤

# "تاوێ لە شاگوڵی تەورێز"

کاتێ بە شاباڵی خەیاڵ
دەبڕم دوند و کەژ و لاپاڵ
دەفڕم بۆ ئاسمانی یەک ڕەنگ
بۆ دەریای قووڵ و شین و پەنگ
بۆ باغچەی گوڵ بۆ پارکی جوان
ئەو جوانیانەی دەسکاری خوان
ڕادەمێنم لە جوانی گوڵ
هەڵدەمژم هەناسەی سونبوڵ
چاو دەگێڕم لە چاونەرمان
دەبمە خولیایی خوێنگەرمان
گمەی کۆتر هاژەی شەتاو
هەوەڵین بریسکەی هەتاو
بێدەنگی دێ و گرمەی شاری
هەستی گەرمی ئەوینداری
بزەی شیرین تۆرانی ناز
نیگای شەرماوی چاوی باز
پەپوولەی جوان کە دەگرێ باڵ
شێنەییتر لە شنەی خەیاڵ
لەسەر گوڵ هەستی ڕادەگرێ
چاوی لە ڕێبوار دادەگرێ
هەموویان دێنە بەر چاوم
دێنە نێو خەیاڵی خاوم
بۆ ملوانکەی شیعرێ هەموو
دێن و لەبۆم دەبنە مووروو
بەڵام زەوقم ویشکی جەورە
قەڵەمم داری دەم تەورە
کاغەز، ڕەشی بێدادیە
دڵ شینگێڕی ئازادیە

کۆشک و تەلاری سەرمایە    چاوی مەی لەبەر هەڵنایە
خۆشی مارەبڕاوی وانە    لە زەوق و هونەر بێگانە
ئەوین هەر لەژێر دەستایە    جوانی هەر لە هەڵبەستایە
شەرحی خۆشی هەر خەیاڵە    خەیاڵیش لای خوا بەتاڵە
ئەی کەی رۆژی هەموو وەک یەک    بوغز و قینمان بکەینە چەک
بلەرزێنین کۆشکی زۆردار    خۆشی بێنین بۆ دێ، بۆ شار
منداڵی ئێمەش وەک ئەوان    نەترسێ لە مۆتەی شەوان
بنوێ لەجێی پاک و نەرم    بخوا چێشتی چەور و گەرم
تا ئەو رۆژە سەر دێنی    جوانیش جوانی خۆی نانوێنی
ئەو ئاواتەم کە وەسەر کەوت    رۆژی روونាکمان وەدەر کەوت
سەد شاگوڵی لە وڵاتم    دەبنە دەسکەوتی خەباتم
ئەوسا منداڵی کوردانیش    لەگەڵ ئەوان نەک بێوانیش
بە تێکڕا کۆمەڵی بەشەر    دەژین ئازاد و بەختەوەر

شاگوڵی تەورێز ۷/ ۵/ ۷۱

# گەزیزە

ئەی گەزیزەی سێ زمانی بێزمان
تۆ پەیام هێنی بەهاری بێگومان

بۆ مەگەر خاکی سڕی زستانی
وا بە سەرمایێ ڕەگی گوروانی

چونکە وانیتە لە سەرمایە چ باک
سەر لە زستانەوە دەردێنی لە خاک

راستە گەر عاشقی شاخ و دەوەنی
بۆیە تۆش چەشنی شەهید کەم تەمەنی

نەک پەیام هێنی بەهاری بەتەنێ
چی ئەویندارە هەنات بۆ دەبەنێ

زۆر وتە و رازی نیهانیم پێتە
تۆ وەها مات و خەیاڵ سەر شێتە

دێت و دەمباتەوە بۆ منداڵی
دێت و دەمخاتەوە سەر شاباڵی

دەچمەوە کۆنە هەواری جاران
من و دێ و عەشق و بەهار و باران

"پیرموحەممەد"، "قەرە تەکیەی" پشت دێ
خێڵی توی باری دەخستن لە ئەوێ

دەنگی مەڕ سەگوەڕی دەوری مێگەل
هەلووکێن و هەپکی لای بەرغەل

پۆلی نازداری بە کوڵ گێلاخە
ئێستە وا یادی فەقەت هەر ئاخە

هاوەڵانی کە نەدەژیاین بێیەک
بە بێیەکتر نەدەچووین بۆ جێیەک

کوانێ مەڕ، بێری و شیر سەتڵ و جام
خۆزگە سەد خۆزگە ئەوێ دەم مردبام

جەغەتوو کەوسەری ژینی لاویم
مەزهەری شیعر و وتەی عەشقاویم

پۆلی ئاوهێنی دەمەو ئێواران
پووڵەکە و سیخمەیی گوێ بەگواران

گەڕەلاوژەی شەوەکانی هاوین
گوڕ و تینی کوڕ و کاڵی لاوین

کوا چریکەی بە "دەنا کورتێ" "سەلام"
چەن لەسەر سەندنەوەی لێیان دام

سەی عەلی ئەسغەرێ بوو بێنێو بوو
بولبولی سەروە بێ تووکی کێو بوو

❁❁❁

حەیفە گەر باسی نەکەم ئەو چاوەش
وەکوو ئەستێرە گەش و رەش رەش
بوونە ئەستوندەکی تاوڵی عەشقم
بۆ شیعر شکڵی ئەون سەرمەشقم
هێشتە تا یادی بە دڵما دەگەڕێ
چاوی دڵ بۆی وەکوو جاران دەپەڕێ

❁❁❁

ئەی گەزیزەی هەوەڵین پەیکی بەهار
سوێند بە کوجکاوری کوژاوی هەوار
گڕی ئەو یادە لەمن هەر ماوە
وا بە هیچ ئاوی غەمێ نەکوژاوە
بۆیە تۆم کردە بەهانەی شینم
یادگاری لە گوڵی نەخشینم
چونکە تۆ دیاری نە ئەو کێوانەی
یادگاری "شەمی" ئەم "دێوانە"ی
تۆ بەهانەی کە خەیاڵی دڵپڕ
لە وەتەن بێتەوە تەیرێکی نەفڕ
لێم گەڕێ هێندێ تریش بڕوانم
یاد بکەم زێد و چەم جێژوانم
تۆ بڵێی ئێستە وەکوو ئەوکاتە
ئەو دەمە ئەو سەرەتە ئەو ساتە
خۆشی مابێ لە دڵی لاواندا
لە دڵی شوان و بەگ و گاواندا؟
خۆزگە بەو ساتە "عەلی" تەنها بوو
شوانی بەرغەل بوو بەڵام وەک شا بوو
شەو ئەمن شیعر و ئەویش گۆرانی
تێر دەبووین هەر دوو لە نانی شوانی
چ بەهەشتێ بوو منالی و لاوی
غەرەز و کینە نەمابوو باوی
باغەوانی یەخە هەر مێخەک بوو
دوور لە ئێستا کە دەم و دڵ یەک بوو
چەن بەبێ دەغدەغە بوو سەرشایی
دەس گیرا لە مەیان ئاغایی
دەنگی "کامحەممەد"ە هەر ماویە تەنین
کاتێ دەیکوت "پێکەنین بو بە گرین"
ئیدی هەر "دۆ" بوو کە کەللەی دەتەزان
گەڕی شایی گەڕەکی غەمیە بەزان

❁❁❁

چونکە ئەم یادە بە هۆنراوە دەڵێم
دەبێ بۆ قافیە سەد دەرکە هەڵێم

مەسنەوی وا دەیەوێ پەڕ بە هەزار
یا رەوان تەبعێ وەکی مامەهەژار

یا خەیاڵێ وەکوو "هێمن" ناسک
تا پەری شیعری هەڵێکا باسک

ئەو بەرەو موکری خەیاڵی زین کا
ئەم لەدەس دەردی جودایی شین کا

چاکە لەو شوێنە بکەم ماڵاوا
بچمە لای باوک و نەڕۆم هەر ئاوا

چونکە من هەرچی هەمە هەستی ئەوە
هەستی من شەتڵی گەشی دەستی ئەوە

ئێستە وا راستە کە بۆخۆم بابم
شەرتە بۆی سینە کەبابی چابم

تاکوو مووی چەرموو لە چۆکم دەردێ
دەنگی قورئان و دەلایل هەر دێ

مووی سپی دایکم ئەگەر دەی بینم
هەڵدەقرچێ دڵەکەی پڕتینم

ئەی گەزیزە وەرە گوێ بگرە دەمێ
با لە ئاخر بەشی ئەم شیعرە کەمێ

من لە دوور هێندێ ئەویش بدوێنم
دایکمە هی ئەوە گۆشت و خوێنم

❁❁❁

دایە ئەی تیشکی شەوانی ژینم
من لەتۆ رایە هەناو تینم

شیری تۆ خوێنی لە رەگما وەردا
لایەلایەت گڕی نوێی تێم بەردا

خۆشەویستی و گڕە مشقاڵی ئەوین
کە هەموو ئێستە منەتباری ئەوین

هەر ئەتۆ کانی ئەوینی دایە
ژین بە بێ‌هەستی ئەتۆ وەک بایە

تاکوو هەم خۆزگە بە ئەو کاتە کەوا
تا نەخەوتبام نەدەخەوتی بە شەوا

وەک دەوای خەو دەبوو چیرۆکی شەوێت
دەردی ئەو کاتە لە ئێستا کە کەوێت

دڵ کەوا ئێستە بە یادت شادە
خۆشترین یادە بژی ئەو یادە

تاکوو هەم دایمە منەتباری ئەتۆم
قسە فێر بوو لە وتەی زاری ئەتۆم

هەرچی دەیڵێم بە زمانی تۆیە
گوفتی تۆ و شیعر و قسەی ئاسۆیە

ورمێ ١٠/١٢/٧٢

# تـرس

هـــەتا جـــوانـــی دیـــوه چـــاوم
قـــەت لە مـــردن نـــەترساوم

تـــا ســیلەی چـــاوم تـــێ‌دەگـــرن
هـــەرچـــی تـــرسە مـــەرگە دەمـــرن

بـــەڵام هـــەر تـــرساوم لەوە
کـــۆرپەی شـــیعرم بگـــرێ شـــەوە

ئـــەمە تـــرسێکی گـــەورەیە
مـــردن لەم کـــات و دەورەیـــە

مـــردن لەنـــێو ئـــەو وڵاتـــە
کـــە ســـەربەستی تـــێدا قـــاتە[1]

کـــاتێ خـــۆشەویستی دەمـــرێ
پـــیاو نـــاوێرێ تـــازیە بگـــرێ

سارۆقامیش ٧/ ٤/٦٨

---

١ - سووژەی ئەم شیعرە تا ئەو بەیتەم لە "شاملوو" وەرگرتووە

## "چاوی جوان"

کـــاتێ چـــاوێ جـوان دەبـینم
هـــانم ئـــەدەن بـۆ هـــەڵبەستێ
ئـــەویش چـــاوێ تـێکەڵ ئـــەوین
نـــازانـــی چـــاو چـــم لێـدەکـا
گش گــــیانم دەتـــــوێنێتەوە

تـــین و مـــــووچڕک و تـــــەزینم
گـــڕ لە گشت گـیانی هـــەڵبستێ
تـــیشکی وەک ئـــاگـــر ئـــەدا تـــین
ڕەنگ‌بـێ هـــیچکەس بـاوەڕنەکا
ســـــەر لەنـــوێ دەم ژێـــنێتەوە

ڕێگای سەقز - بۆکان پایزی ٦٩

پێشکەش بە کاکڵ عومەری سوڵتانی "وەفا"

# بەهاری ٦٦

دای لە دەماخم بۆنی بەرەزای کوێستان بە شەماڵ
بولبولی تەبعم خوێندی لە جەزای کەوتە گوڕ و گاڵ
شنەی نەسیمی دەم بەیان کاتێ نەشەی کا دەروون
لە رەشی دڵان گەشی دەخاتێ تیشک و تاوی بوون
هەوران بە هەیبەت کەوتنە داخوڕین وەک نەعرەتەی بەور
شەتاو وەکوو شێت هات بە کەف چڕین بە فرمێسکی هەور
عیشوەی دار چنار بە گەڵای تازە سۆزی بڵاوێن
قۆپی و قەراغاو هەوارگەی نازە جەرگ و دڵ تاوین
کارگی لە نواڵان سپی و ساف و سۆڵ لە بەرزی و نەوی
هاتنەدەر چەشنی مەمک خڕ و خۆڵ لە سینگی زەوی
گمەی گا کۆتر لەبەر "شای مەردان" چەن شادی هێنە
سیررەی هەڵۆی بەرز لەرژ دوزەردان زەراو تۆقێنە
قاسپەی خاسەکەو لەسەر دوندی کێو مەوج دەخواتەوە
لە دارستاندا بولبولی بزێو جوابیە داتەوە

چریکەی بەرزە بولبولی روخۆش     لە داواتی گوڵ
دای لە مێشکی شیعر شاعیر بوون بێهۆش     بۆنی قەرەنفوڵ
گوڵەباغ تانەی‌دا لە دار شیلان     بۆیە زوو پشکووت
قومری قەناری بانگ کرد بۆ دیلان     یەکیان‌گرت‌جووت‌جووت
تک‌تک فرمێسکی رنووی داڕزاو     دەرژێتە سەر عەرز
زنەی کرد مێرگ و کانیاو شەتاو     رازان بە سەد تەرز
پۆلی شل و مل هەڵگەڕان بە ناز     چوون بۆ گێلاخە
پڕیان کرد سینگی پڕئاخم لە راز     خۆزگە بەو ئاخە
رەشماڵ هەڵگەڕان بۆ دوندی کوێستان     هۆبە بەهۆبە
شمشاڵ بەفووی دڵ هاژەی دێ شەوان     ئای تۆبە تۆبە
کیژی هەوارچی گەر لەبیرت کەم     تۆبەی مەرگم بێ
با ساتێ سەیری جامی شیرت کەم     کزەی جەرگم بێ
دەنگی زەنگی مل مەڕ لە ئێواران     لەو شاخ و زەردە
کارەی مەڕ لە گەڵ هۆهۆی جوتیاران     یاسینی دەردە
پەپوولەی رەنگین باڵی کراوە     بە سۆزەی شنە
پۆلی پۆڕی شل وان بە حەواوە     یا دێن بە قنە
لە شەرمی دڵدار گوڵ هەڵگەڕا سوور     لە رەنگی سکڵ
ئاوەنگی دەردا گوڵاڵە و چنوور     نیشتەی پەڕەی دڵ
لە شار و لە دێ دەنگی گۆرانی و     بەزم و سەمایە
کەویار و نەشمیل کیژی بۆکانی و     ئای لایە لایە

فوو دەکەن لە گشت چرای غەمباری رۆژی روون هەڵدێن
گەشاوە پولووی عیشق و دڵداری دڵتەنگ بوون هەڵدێن

❁❁❁

بەڵام نەوبەهار ئەمساڵ دڵتەنگە ئەویش دوو رەنگە
کوردی ماڵ رووخاو سووتاوی جەنگە وەک پوورە هەنگە
شەونم لەسەر گوڵ وەک ساڵانی ساڵ خۆر نایباتەوە
بەتایبەت گوڵی هەڵەبجە و خورماڵ هەڵناداتەوە
ئاخ بەهار خۆزگا بمزانیبایە چەن چەرخ و وەرزە
ئەم هات و چوون و گەڕانەت وایە لەم سەر رووی عەرزە
چەن جاران لەشی سڕی زستانت بووژاندۆتەوە
چەن جاریش چرای نێو گوڵستانت کووژاندۆتەوە
یاخۆ هەتاکەی درێژەی دەبێ ئەم چەرخ و خولە
ئاخۆ چی لێدێ هەر خودا نەبێ گشکەس لێی خولە
دیارە گەڕانی بێوچانی تۆ بێسەبەب نیە
بەڵام هەر بەتۆ دڵخۆشە ئاسۆ نازانم چیە؟

نەورۆزی ٦٦

# پاییز

پاییز، دڵتەنگ، پاییز ڕەنگ زەرد
من بە فرمێسک تۆ ئاهی سەرد
با هاوارمان بگرێ ئاسمان
تۆ بۆ گوڵ و من هاوڕێکان
تۆ بۆ باغی زەرد هەڵگەڕاو
من بۆ شیعری پەنجەی پەڕاو
تۆ بۆ گەڵای ویشک و بێتین
من بۆ لێوی ویشکی ئەوین
تۆ بۆ جۆگەی قەوزە گرتوو
منیش بۆ هاوڕێی لەدەس چوو
تۆ بۆ کانی ویشکی بێئاو
من بۆ زنەی فرمێسکی چاو
وەرە تۆ شینگێڕبە بۆخۆت
با ئەمنیش بی‌سێنمەوە بۆت

---

پاییز دڵتەنگ، پاییز ڕەنگ زەرد
من بە فرمێسک تۆ ئاهی سەرد
با هاوڕێ بین بڕژێ بەڵا
لە من فرمێسک و تۆ گەڵا

---

پاییز من هاوڕێی خەمانم
ئاخم، ئۆفم، دەردم، ژانم
زەردەم لێ‌بوو بە زەردی تۆ
لێوم سڕە و نایەتە گۆ
پاییز منیش وەک باغێ بووم
بەدەس خەزانێ زوو ڕەس چووم
هەر بە سەوزی گەڵام وەرین
زەلکەم لێ‌بوە بەحری بەرین
تاڵی بادەی سووری دەوران
خەمی ئاواتی نێو هەوران
هەر بە لاوی پیریان کردم
تیشک و تاوی شەوقیان بردم
ئێستا منم و ئازاری شەو
ئێستا منم و چاوی بێ‌خەو
دڵ گۆڕستانی ئەوینە
ناموی نیگا و پێکەنینە
پێکەنینی لێوێکی ئاڵ
هەودای نیگای دوو چاوی کاڵ
هەر چەن ئەوین قەت نامرێ
ژەنگی لەبیر چوون ناگرێ

❀❀❀

پاییز ڕەنگ زەرد، پاییز هاودەرد
من شیعرم هەن تۆ ڕەنگی زەرد
بگری بگری، نمنم، تۆ تۆ
توندکە هەوری دەمەو ئاسۆ
مەگری بۆ من، بگری بۆ خۆت
با ئەمنیش بی‌سێنمەوە بۆت
بگرین بۆ مەرگی پێکەنین
بۆ چاوی سووری دەریای شین
بۆ سازی بێ‌نەوا و ئاهەنگ
بۆ گۆرانی‌بێژی دڵتەنگ
بۆ شاعیری بێ‌دەستەڵات
ئەویندارى جوانی و خەبات
بۆ زەوقی لە دڵاندا مردوو
بۆ ژیلەموی چاوەڕێی فوو
پاییز پاییز، ڕەنگ زەرد، دڵتەنگ
بگری دڵ پڕئازار و ژەنگ
مەگری بۆمن، بگری بۆخۆت
با ئەمنیش بی‌ئەسێنمەوە بۆت

❀❀❀

بۆکان ٧١/٩/٢٦

# بۆ جوانێکی نەناس

چاوەکانت کانگای تیشکن — دەریایەکی قووڵ و ویشکن
تێیدا دەخنکێن مەلەوان — بێشەپۆل دەڵێی لە خەوان
بەخەوتوویش چەن بێدارن — نەخۆشێکی بێئازارن

❁❁❁

نیگات دەفڕن وەک پەپوولە — خۆ دڵی منیش هێند عەجوولە
تا زەرد نەبی لە زێڕی باڵ — دێتە بن چارشێوی خەیاڵ
دەخوشێ بەرەو تیشکی نیگات — تێر دەروانێ لەسەر تا پات
خۆی دەکاتە ونبووی چاوت — نەچیری چاوی خۆش ڕاوت

❋❋❋

زوڵفەکانت پەڵەی هەورن — بەڵام کوا خاوەنی جەورن
نە ڕەشمارن نە عەقرەبن — بە بڕوای من یەک مەکتەبن
چونکا لەتاو تاڵە قەفقەفە — فێر دەبم دەرسی فەلسەفە
لاڵ دەبم دیارە تاڵ تاڵ سپی — تیا نایەڵێ کڕی و کپی
دەبنە تیشکی عیلم و زانین — پێم دەڵێن: "دەوەرە هەروانین"
بەفری سپی زستانی لەش — خۆ دەشباری لە هەوری ڕەش
منیش بەم دەرسە کۆ دەبم — هێندەی دیش تامەزرۆ دەبم
دەڵێم تا هێزم تیا ماوە — تا شەوقی هەن ئەو دوو چاوە
بێوەی لای کەس بیدرکێنم — دەستێک لەو هەورە وەربێنم
ئاخ ئاوات و حەز چەن بەندین — لەنێو ئەوین[1] وێنەی ئەوین
تا نەبنە گرێی دڵی پڕم — با بە شیعرێ دەریان بڕم
کوێربم تۆ لێم حاڵی نابی — کوتری کێویت ماڵی نابی

ڕێگای ورمێ - مەهاباد ٣٠/١٠/٧١

١ - زیندانی ئەوین

# "ئاگری تەڕ"

پەری شیعرم هەوێی خۆشەویستی تۆیە بۆیە   بۆم نایە تا بیدرکێنم
گەر دێم بیلێم گوم دەبێ لە نێو خەیاڵت   ئەوجار فورسەتی لێ دێنم

✿✿✿

لەشەرابی پیاڵەی چاوی ئەتۆی کەمێ   پیشان دەدەم، دەبێ مەدهۆش
ئەوجار دێتە خەیاڵخانەت کە چاوانمەو   ئاگری تەڕم داوێتە گۆش

✿✿✿

هەڵدەقرچێم دەبمە بریشکە سەر سێڵ و   سێڵاوی هەستت دەممالێ
دەمکاتە پووشە نەرمەکەی بابردەڵە و   ئەدریمە دەس بای شەمالێ

✿✿✿

جاری واشە دەبمە تەیر و بە خنجێری   باڵم سینگی شەو شەق دەکەم
بەڵام چونکە بێ هێلانەم ناچار رووڵە   دڵی هاوڕێی دڵ ڕەق دەکەم

✿✿✿

من ئازارم پەتام دەردم لەوێش رام ناگرن   دەر دەکرێم، بێ هێلانە
هێندەی دیکەش دەتوێمەوە و وەڕەز دەبم   لەو خزم و هاوڕێ گێلانە

✿✿✿

دێمەوە ژێر باڵی سەوزی خەیاڵەکەت   کە چەن بژوێنەوە زەنوێر
هەناسەی سارد دەبێتە فوو گەرووی بێدەنگ   دێتە ناڵە چەشنی بلوێر

✿✿✿

ئەمجارەدەبمەکەیخوسرەوی مەداینەرووخاوەکەی   کۆشکی دڵم
نەکیسای شیعری تۆ بلوێر تێکەڵ دەکەم   جا تۆش دەبیە ساقی گوڵم

✿✿✿

پەیپەی لە کوویەی ئارەزوو و شەراب   دەرژێنێتە جامم دەمکەی سەرخۆش
خۆ بە رواڵەت کێ دەزانێ چۆن رووخاوە   کڵی دەروون حەتتا ئەتۆش

✿✿✿

بەڵام گیانە لێت نەگۆڕێ دنیای سەفای — ئەوینی من هەر خەیاڵە
سۆفیلکە نوێژ نەزانەکان دەڵێن خەیاڵ نابێتە ماڵ — چون بەتاڵە

❁❁❁

کە تۆش وابی زێر و ماڵ بە روومدا بێنی — حاشا لە عیشق و جەماڵت
من دەنگی رۆحی تۆم دەوێ هەر لەبۆ خۆت — شانازی و سەروەت و ماڵت

❁❁❁

من پەپوولەی شەمی جەماڵی هەستی تۆم — دونیای دەروونم خۆش‌دەوێ
گەر پێت وایە سووکی پەلەو پارەم، برۆ — ئەوینت رۆح بێ نامەوێ!!!

❁❁❁

ئاخ خەیاڵ چەندە سەرکێشی بۆ کوێ دەچم — دەمبەیتە کوێ بە بێ‌خۆ بوون
حاشا لە شەو لە گرشەی زێری تاریکی — بمبەوە لای هەتاوی روون

❁❁❁

بمخە سەر شاباڵی تیژت بمبەوە باوەشی — سوروشت روو بکە چیا
من گۆچکراوی ئەستێرەم بولبول بانگی‌دا بە گوێما — لەسەر بەرماڵی گوڵ و گیا

❁❁❁

من تۆزقاڵم با تێکەڵی هەتاو بم جا — دەبمە شتێ من دڵۆپێکی بارانم
ئەو هەوری بارانهێنەرمەو تاکوو لێ جوێم — هەر خۆزگەخوازی جارانم

❁❁❁

تاکوو شەماڵ رادەژەینێ بسکی شۆڕەبی — و دای دێنێ پەنجەی هەتاو
جریوەی مەل دەبێتە سەنفونیای عیشق و — بولبول مەست دەبێ لە گوڵاو

❁❁❁

تا بزەی مانگەشەو مابێ و بولبول حەیران — بڵێ لەبۆ گوڵی شەوبۆ
تا بەهاران پشتوێنی کولکەزێڕینە — بهاڵێتە کەل و ئاسۆ

❁❁❁

تا بەیانیان کور و کاڵان رێگە ببرن بەرەو — قوتابخانە بە ریز
تیشکی بەهار بێتە هاوین زستان — بنێژرێ دوای پاییز

❁❁❁

تاکوو پەنجەی تەزیوی شیعر و هەڵبەستم کوورەی دڵی قوتابیانم وەخۆی بگرێ
لە مەوزووعی ئینشاماندا شادی بزێو دێوی ناهومێدی بمرێ

❁❁❁

تا لە ئاسۆی ناڵەشکێنە تیشکی هەتاو کوڵمی کێوەرەش بکا داخ
هەتا رۆحی حەسەنزیرەک دەچێتە سەر ناڵەشکێنەو دەیلێ بەرانبەر بە سابڵاغ

❁❁❁

لێم نانیشێ ترسی شوورە و قەڵابەند و زیندانی تیپی بێ هەستان
هەتا ماوم بۆ خۆم دەژیم بۆ دڵ دەڵێم شیعر و مەقام و هەڵبەستان

❁❁❁

من هەر شای خەیاڵی کۆشکی دڵی خۆمم هەزار ساڵم بکەن لۆمە
نەگۆڕاوم قەت ناگۆڕێم خۆشەویستی ئەم وڵاتەم پیشەی لەمێژینەی خۆمە

بۆکان ٢/١١/٧٢

## "چەن دیمەن بۆ چاوەڕێیەک"

بووکی بەهار رازایەوە سوروشت پڕپڕ لە جوانیە
دەنگی شەتاو، جریوەی مەل بە سۆزترین گۆرانیە

لە گفەی باڵی تەیری مەست مەلی خەیاڵ رادەچڵەکێ
لە هەرچی دەڕوانی جوانە چی دیمەنە، نە هەریەکێ

لە رۆژاواوە بووکی خۆر دەیەوێ بچتە پەردەوە
زاوای شەو چاو لەرێیەتی دەبا بمرێ بەو دەردەوە

لە رۆژهەڵات مانگی سپی وەکوو تۆپێ سووک و گەورە
نێوگەزی هەستاوە لەسوێ دەڵێی گلۆڵەیەک هەورە

دەناڵێنێ بۆ سرتەی شەو لە جێژوانی زیندووی لاوان
بزەی دوو دڵدار تێکەڵ بێ لە گەڵ هاژەی سەر شەتاوان

من چاوەڕێی خشەی پێیم بێت و رۆح بدا بەم شوێنە
جوانیەکان جوانتر ببینم لە رووی ئەودا وەک ئاوێنە

ئاخ چەن جوانە ئەم دیمەنە ئەم رۆژاوا و مانگهەڵاتە
مانگەشەوی لە رۆژ جوانتر شەوەزەنگ بێدەستەڵاتە

قـیژەی سـەقرێک دێتە گـوێچکەم نـــابینم چـــاوە جــوانــەکــەی
مــنیش وەک ئــەو دەروون کـەیلم کـــەچی ئــەو گــەییە لانــەکــەی

❁❁❁

مــــانگ هـــەتا دێ گــەشتر دەبــێ هــەتاوی ســوور ونبــوو لەســوێ
ســــــەقر شـــوێنەواری نـــــەما مـــانگ بــە چــپەلە گــەڵم دەدوێ

❁❁❁

ئــــەم دیـــمەنانە وەک تــەمەن بـــەپرتاو دێـــن تــێپەڕ دەبــن
خــــۆزگە زۆرکــــەس بـــێدیبایە وەک جــوانـــن لەبــەر چاوی مـن

❁❁❁

ئـــێوارەیـــە کـــات بـــەهارە تـــەنیام تـــەنیا بـێکەس هـاواڵ
مــەستم، مــەستم، مــەستیجوانــی نـەک مــەستی بادەی تـرش و تـاڵ

❁❁❁

مـــانگ بــوە مــوجوعمەیێ زێــو ئـاسۆش ســوور هــەڵگەڕاوە لێم
خۆر غەرقی خوێنی پیاوچاک بـوو بــــەڵام مـــن هـــەروا چـاوەڕێم

تورجان ١٨/١/٧٢

# تاکەی؟

نازانم بۆ دڵم پڕبوو لە تاسە یا لەوبەری پەردەی خەیاڵ چ باسە؟
نازانم بۆ گڕی پولووی دەرد و ژان لێی تێکداوم هەستی مەستی چاوی جوان
هێند دڵتەنگم مەیش ناکا سەرخۆشم وشکاوی دێ ئاوی هەست و خورۆشم

❁❁❁

جاری واشە سیمی تاری شادی دڵ بە میزرابی بڕۆی چاوێ دێتە کوڵ
کامە نیگا؟ ئەو نیگا وا پڕرازن وەک خەنجەرەی عاشقی خۆش‌ئاوازن
ڕۆحی گوێگر دەبا و دەڕوا بۆ ئاسمان بۆ نێو دەریای خەیاڵاتی سەوز و جوان
بۆ ڕوون دەکەن تاریکایی رازانم؟ پرسیارێکە و چۆنە جوابی؟ نازانم

❁❁❁

نازانم بۆ قوفڵی سندووقی سینە ئەو سینەی وا چەشنی کوورەی بێ‌تینە
وەک تەلیسمێ هەڵناگیرێ بە هیچکەس گاڵە دراوە بۆ دڵ بۆتە یەک مەحبەس
تا ئەو قوفڵە من هاوڕێی دەرد و ژانم تاکەی دەبێ هەڵنەگیرێ؟ نازانم

❁❁❁

تاکەی لرفەی سەر شەتاوی ئاواتم بێتە گەراو بە بەردی خوێی داهاتم
تاکەی ماسی‌خزی دەریای سینگی یار ژار قولابی دڵڕەشانی بچتە زار
منیش توونی چۆرێ ئەو ئاوی دەریا بووکی ویستم بەرگی ڕەش بێ لە بەریا
تاکەی پڕ بێ لە خۆی زامی تازانم؟ یاکێ دێت و چاری دەکا؟ نازانم

بۆکان ٤/٢/٧٢

# لە گەڵ جەغەتوو

جەغەتوو دایکی مناڵی و لاویم — مەزهەری شیعر و وتەی عەشقاویم
جەغەتوو چۆمی وڵاتی کۆنم — بۆچی ناپرسی لە دووریت چۆنم
من لە دووریت وەکوو ماسی گیراو — نیۆزگم رەش بوە بۆ قەترەیە ئاو
ئەی ئەتۆ چۆنی ورەت هەر ماوە؟ — بۆ وەها هێزی شەپۆلت خاوە؟
گوڕ و تینت نیە بۆ چەشنی چەلان؟ — دەورەکەت چۆڵە لە هێلانی مەلان

❁❁❁

جەغەتوو دێتەوە بیرت لەوە پێش — حیلەکەت هەر وەکوو ئەسپی سەرکێش
زەندەقی دوژمنی بێتینی دەبرد — خوێنی ژین بوی لە رەگی میللەتی کورد
چیە ئەی بۆچی نەما ئەو تاوەت — شینە دەیگێڕی بە جێگەی داوەت؟
زەردە ماسی لە بنت هەر ماون؟ — یا ئەوانیش وەکوو مە خنکاون؟
ئێستەکەش باغی بەهەشتی بوقەشە؟ — یا نەما بۆ گەلی وانیش چنەشە
کۆانی لرفەی لە بەهارت ئەی چۆم — هیچ مەترسی کوری خۆتم ئاسۆم
وەرە بێهێچ خەم و بێترس و درۆ — بێئەوەی تێکی بێنێی چاو و برۆ
پێم بڵێ تۆش وەکوو من غەمگینی؟ — هەڵوەدای دڵبەرێ لێو نەخشینی؟
یا لەبەر قەمچی تریشقەی زاڵم — وەک ئەمن ئێستە شکاون باڵم
هێزی باڵت نیە، وا مەندی لە دەو — نیتە ئەو لرفە و هاژە و تەق و رەو؟

❁❁❁

کوتی رۆڵەم چیە ترست لە سەهۆڵ — هەر لە دوور خۆشە کوڕم دەنگی دەهۆڵ
لێمگەڕێ تاکوو هەور دێتە گرین — دڵی سارێژ دەبێ کوێستان لە برین
ئەو دەمە چاو کە لە سێلاوی بەهار — بە غورەم دێ لە نشێوو لە نسار
ئەو دەمەی ماڵی منیش پڕپڕە بێ — لەشکری بەفر و سەهۆڵیش قڕە بێ
غەم و ئەندێشە نیشانەی بوونە — هیچ مەترسێ کوڕم ئاسۆ روونە

قشلاخ سەد - ٧٢/١/١٢

# خەبەرێکە و لە موکریانەوە دێ

شەوە تاریکە، تەم و بەستەڵەکە
لەشکری خەم لە گەری ڕەشبەڵەک

لە چجێ نایە هەناسە و نەفەسێ
بزە نایێتەوە سەر لێوی کەسێ

چاوی هەڵبەستە بە گریانەوەیە
کۆستی ئەمجار لە موکریانەوەیە

مانگ لە ئاسۆ بوە ئاوا، شەوەزەنگ
دڵی ئەستێرەیی گشت کردووە تەنگ

چاوی شەو شۆڕە لە ئاسۆی خەمەوە
خۆ دەلەنگێنێ بە بەرگی تەمەوە

ڕەشەمە هات و ڕەشی کرد کەژ و کۆ
ڕەشتریش بەرگی سەتی وەک ئاسۆ

بەم شەوە دڵ بە هەوای زینی خەیاڵ
دەیەوێ لەم شەوەدا دەرچێ لە ماڵ

دڵە بۆ تەنگی چقەوماوە لەتۆ
چخەمێ بۆتەوە هۆی شینی ئەتۆ

شەوی زستان بەتەنێ دەرمەکەوە
ساردە سەرمایە چتاریکە شەوە

چیە؟ بۆکوێ؟ بە هەوای کامە خەیاڵ
وا وەها زینە لە بۆت ئەسپی خەیاڵ

دڵ دەڵێ بانگێ بە گریانەوە دێ
خەبەرێکە و لە موکریانەوەدێ

شاپەری باڵی خەیاڵ دەشکێنێ
چهەواڵێکە هەوای خەم دێنێ؟

ڕێکەوە ڕوو بە مەکۆی دڵداران
شیوەنە و شینی هەزارە و یاران

بە پەنای کێوی لەمێژینەی کورد
"کۆنە هاورازی سەفین و هەڵگورد"

تێپەڕە ڕامەوەسە دڵ بەخەمە
سەری سوڵتان وەکوو سابلاغ بە تەمە

""هێمن" و "حافز"ی سابلاغی بەڕێز
وا بەجووت تەرمێ دەگرنە ئامێز

دێن هەتا قیبلەیی دڵداران بن
"هەر هەژار هێمنەکەی جاران بن"

لە گڵێشا لەپەنای یەک دوو بە دوو
ببنەوە پێکوڵەکەی چاوی عەدوو

ڕاپەڕە خەون و خەیاڵ ئیدی بەسە
وا هەژار ڕۆحی فڕی لەو قەفەسە

چوە نێو چاهەوە وەک مانگی سیام
شەوقی هەر باقیە بۆ ڕۆژی سیام

پەیکرا پێی ئەدەبی کورد و شەلی
گری گرت جەرگی خەیام و بووعەلی

دەوڵەمەندێکی کە ناسرا بە هەژار
ئەدەبی یەک گەلی کرد ساز و تەیار

باخی هەڵبەستی وەکوو باخی گوڵە
کۆشکی نووسینی سەفای ڕووح و دڵە

ڕاستە ڕۆیشتووە قەت نایەتەوە
نامرێ! ماوە! لەکوێ مەرگە ئەوە؟!!

لە دڵی تەکتەکی ئەم خەڵکەیە جێی
قەڵەمی مەشخەڵ و هەر ڕۆشنە ڕێی

# لە مێژە

لەمێژە نوتفەدانی هەستی شیعرم      بەتین و تاوی دەرد و ژانی بوونی
ئەزێتە ناخی شیعری پڕ لە تاسەو      هەناسەی چەشنی ژێ تاری دەروونی

❁❁❁

لەمێژە ئاهی تاساوی قەڵەم شەو      لە تاو ئازار و دەردی دیمەنێ دوور
دوو چاوی گل دەکا و هاتۆتە ئەژمار      لە حەسرەت دەرد و ژانی شیوەنی سوور

❁❁❁

لەمێژە پێوە بووم شینێ بگێڕم      لەبۆ ئەو تەرمە کۆرپانەی وەبێکەس
لە کووچە و سەر شەقام و چۆڵ و هەرداڵ      وەبێ‌گیان کەوتوون بێ‌تین و بێ‌هەس

❁❁❁

لەمێژە خوێنی خەستی ئەم گەلەی کورد      دەنەخشێ کوڵم و هەنیەی گوێ زەوی پێی
بەڵام ئەمجارە دەستی هاتە کایە      هەڵەبجەی مرد و هیچکەس خوێن نەهات لێی
لەمێژە چاوی فرمێسکم ئەگریا      بەرووی شاری هەڵەبجەی بێکەس و کورد
بە رووی دەردا بە رووی ژانا چڕانێ      بە رووی زوڵمێ کە زۆرداریێ لەمەی کرد

❁❁❁

لەمێژە کۆت و زنجیرن وشە و دێڕ      لە بەندیخانەیی هەست و شعارم
هەتاکوو ببنە مووررووی رشتە شیعرێ      لەبۆسای گەردنی بووکی بەهارم

❁❁❁

وەدەرخەن هەستی شاراوەی دڵ و گیان      وەکوو گیای خاکەلێوەی دەشت و دیمەن
پیان روون بێ دڵ و موژدەی بەهار بێ      کەچی دەنوێنێ یادی تەرم و شیوەن

❁❁❁

کەچی دەنوێنێ یادی شین بەجێی شین      دوو چاوی سووری شیعری شینم ئەمشەو
وشە وەک گوللە دەسمن جەرگ و ناخم      بە زیندویی ئەدەن تەڵقینم ئەمشەو

❁❁❁

شەمی شەوگاری تەنیاییم بە فووی غەم    گوژاوە و هێرشی دەرد و غەم و ژان
وەراندی غونچەی ئاواتی خەیاڵم    کوژا کۆرپەی خەوم بێ‌سووچ و تاوان

❁❁❁

کەوابوو شیعری گوڵلاساوەرن دەی    لەنێو خانی دڵم سوور خۆن بەرەو دوور
شەقی کەن سینگی سەنگینی دژی کورد    کە نووشتووی چەن بەهاری خستە تەندوور

❁❁❁

وەرن ئەی خاوەنی مافانی ئینسان    وەرن تێکرا لە خەو رابن کەمێکی
بەسە بەس باسی ماف و لافی ئینسان    بەشەر بن تو خودا خۆتان دەمێکی

❁❁❁

وەرن تێکرا بزانن ئەم وڵاتە    هەموو گیانی برینە و وا بەپێوە
چ سەردەشت و چ بانە و چ هەڵەبجەی    هێروشیمایە کوردستانی ئێوە

❁❁❁

نەپەل‌پەل بەڵکوو پۆل‌پۆل هەڵوەریون    گەلای جوانی منالانی هەڵەبجە
بڵێی حەق‌سێن لە دونیا بێ بسێنێ    حەقی کوشتار و تالانی هەڵەبجە

❁❁❁

ئەمن ئاسۆی غەمی ئەم دەردە گەورەم    چلۆن هێزم هەیە هەڵبەستم ئەشعار
ئەگەر سەد هێندە خۆ رادەم بە یەزدان    وتەم بۆی چەشنی عوشرێکە لە ئەشعار

بۆکان - خاکەلێوەی ٦٨

# "فەرهەنگۆک"

((ئـ))

ئاراز:..............٪چۆمی ئەرەس
ئەرژەنگ:....٪کتێبی مانی پێغەمبەری نەقاش
ئاوی روو:.............٪ئابروو. حەیا
ئەوک:................٪مل. گەردن
ئەنقەس:...........٪عەمدی. بەدەستی خۆ
ئاقیق:.....٪عەقیق. بەردێکی سووری قیمەتی
ئەلکەن:..........٪لاڵ. تور. لوکنەت زبان
ئاوس:...............٪زگ پڕ. باردار
ئەستوندەک:.....٪شاتیری چادر و ڕەشماڵ-
...................٪کۆڵەکەی چادر

((ب))

بەردەباز:...........٪ریزە بەردی دایدەنێن
بۆ پەڕینەوە لە جۆگە و جۆبار
بەشقی:...........٪بە عەشقی. لەبەر خاتری
بەڵەک:............٪ڕەش و سپی تێکەڵ
بۆژۆ:..............٪بوژە. دەس لێدراو
بژوێن:.......٪زەنوێر. خۆش ئاو و هەوا و پر
..............٪لە گیا. سیفەتی کوێستانە
بەندیخانەی ئاسۆ:....٪ناوی بەندیخانەیەکی
.........٪کوردستان بوو
بین:...........٪نەفەس کێشان لەبن ئاو دا
بین:...............٪بنیە قاقا. مل
ببێم:..............٪ببیستم. ببیەم
باشوو:...........٪واشە. تەیرێکی راوچیە
بەها:................٪قیمەت
باو:................٪مۆد. رایج
بزە:...............٪زەردەخەنە
بەستەزمان:........٪فەقیر. بێدەنگ و
..................٪دەستەڵات
بەژن:..............٪باڵا. ئەندام
باسەر:....٪بایەکە لە رۆژهەڵاتەوە دێ
بادەوە:.......٪کوولاک. بای هەورێ
...................٪لە گەل بەفر
بێدادی:.............٪زوڵم کردن
بزێو:............٪شلووق. هار و هاج

((پ))

پتەو:...............٪قایم. مەحکەم
پوورە:.....٪شەڵخەی مێش هەنگوێن.
.....٪کۆڕی مێش هەنگوێن بە یەکەوە
پەڕپووت:.........٪جۆرە باڵندەیەکی
..........٪چۆمیە لە مراوی بچووکترە
پەڵەی هەور:.........٪توودەیەک یا
.٪بارستای هەورێک کە دەوری ساو بێ
پەڵەی باران:.......٪تا رادەیەک بباریێ
.....٪وشک و تەری عەرز لە یەک بدا
...............٪دەڵێن پەڵەی داوە.
پەرژین:...٪حەسار کردن بە گیا و دارو
....................٪درو

«ت»

تریشقە:..........٪هەورە گرمە
تووری سینە:.....٪کێوی تور لە دەشتی سینا.
.........٪لێرەدا ئیزافەی تەشبیهی. سینە
..........٪تەشبیە کراوە بە کێوی توور
..........٪وەجەشەبەهئاگر تێ چوون
تاسەبار:.........٪ئارەزوومەند. بیر کردوو
تەفرە:...........٪فریو
تەوار:...........٪مێ هەڵۆ. بازی مێ
تاساو:.........٪نەفەس لە سینگدا حەبس کراو
تەرت و توونا:......٪دوور خراوە. بێ سەر و
...................٪شوێن
تەشەر:...............٪تانە. لاتاو
تاپۆ:..............٪سێبەر. شەبەح
تەکفیر:........٪بە کافر زانین. بە کافر ناسین
تەپکە:............٪بۆسە. داو
تورت:.....٪ناسک و تەر. دژی جیر و نەپچڕ
تەمووز:...........٪یەکەم مانگی هاوین
تەرم:............٪لاشە. جەسەد
تەوژم:...........٪تین هێز. فشار و زەخت
تەشرین:..........٪مانگی ١ و ٢ پاییز
...........٪لە ساڵی رۆمی دا
تروسک:.........٪بریقەدانەوە. بریقە
تامەزرۆ:......٪کەسێ زۆر ئیشتیا لە شتێ بێ.
...........٪ئاواتەخواز
ترۆپک:...........٪قوللە. نووچکە. دوند
تەبار:..........٪تایەفە. خێڵ. عێڵ
تاوڵ:...........٪چادر. رەشماڵ

تێو:.........٪تەب. گەرمای لەش

«ج»

جۆکەنار:......٪قەراغ جۆگە ئاوێ کە
.........٪کۆڕی یاران لە دەوری
.........٪مەجلیس ببەستن
جار:..........٪پەڵە گەنم و یا جۆ و
..............٪غەللاتی درواوە
جەغەتوو:.........٪ناوی چۆمێکە لە
..........٪کوردستان. زررینە روود

«چ»

چەو:.............٪زیخ. ماسە
چقڵ:...............٪درِوو
چاوچنۆک:........٪سەقیل و خەسیس
چمۆڵە:...........٪پووکاول، جۆرە
..............٪تەوهینێکە
چاوروا:...٪شایەعە، قسەی دم خەڵک
چوارمێخ:.........٪بەسەلیب کێشان،
........٪لە چوار لاوە داکوتان
چوارپێ:..............٪سەگ
چەرموو:.................٪سپی
چاخ:..........٪دەورە، زەمان، عەسر
چۆک:...............٪ئەژنۆ
چل پلەی عومان:....٪ناوی شوێنێکە لە
.......٪بەیتی خەزالە شۆڕ داکە چەن
.........٪دز لە وێ رێگریان کردەوە.

«ح»

خەس:...............٪غەلیز، دژی تراو
خاهان:..............٪ویستیار، خوازیار
خناو:...........٪خندروا، ئاخندراو. پڕبوو
خۆرهەستان:...........٪خراسان لە ئەسڵدا
...................٪خۆرئاسان بوە
خێو:...............٪ساحەب، خاوەن
خول:.................٪گێژ، ور
خول:...............٪دەور، ساڵ
خنجیلانە:...٪جوان و چکۆڵە و خۆشەویست

«د»

دەفر:..............٪کاسە، زەرف، وەسیلە
دڵگر:......٪ئەم وشە لە وشەی ئەزدادە هەم
..........٪بە مانای شتێکە دڵ پێی جوان بێ
......٪هەم مانای شتێ دڵی عیسان تەنگ کا.
.........٪لێرەدا بە مانای دڵخواز و دڵویستە
داهات:..............٪دەرامەد، دەخڵ
دەس بەسەر:...........٪تەحت نەزەر. لە ژێر
...................٪چاو دێری دا
دراو:..................٪پوول
دەمار:..................٪رەگ
دڵۆپ:...................٪تکە
دژ:................٪زید، موخالیف
دووراو:........٪بەستراو بە دەزوو و دەرزی
دژوار:............٪سەخت و موشکول
دەروەست:.........٪پایەداری، تەعەهوود

دۆڕاوە:....٪بە قومار دانراو، ئەوشتەی
..........٪لە قومار دا لە دەس بدرێ

«ر»

راین:..........٪نێوی چۆمێکی ئاڵمانە
رژد:..............٪هەڵدێری توند
رژد:..........٪خەسیس، چاوچنۆک
رەشبەڵەک:......٪هەڵپەرینی ژن و پیاو
...................٪پێکەوە
رێچکە:...........٪سەف. ریز بەستن
رۆژپەڕ:......٪دەمەو ئێوارە، غورووب
رزوان:................٪بەهەشت
رەگاژۆ:........٪ریشەبە هەرلایەک دا
..................٪داکوتان
رێز:....٪ئیحترام، قەدر و قیمەت دانان
رام:..............٪ماڵی، دەستەمۆ

«ز»

زەو:..........٪کاتی زایینی گیانداران
..............٪بە تایبەت حەیوان
زناو:...........٪کانی کە فەسڵی بێ،
..............٪هەمیشە ئاوی نەبێ
زار:................٪دەم. دم
زار:..............٪گریان. ناراحەت
زەررە:......٪تۆزقاڵ ئەو تۆزەی لەبەر
.......٪سێبەر و تیشک بە دەور ئاسمان
......................٪دەڕوا

زەنوێر:..........٪خۆش و ئاو و هەوا، پر
.................٪لە ئاو و گیا
زیت:..............٪وریا، زرینگ

«ژ»

ژیر:................٪عاقل، تێگەیشتوو

«س»

سڵ:...٪رەوەک، هەڵاتن لەبەر شتێ لە ترسان
سیبل:........٪نیشانە لە کاتی تیرەندازیداکە
..................٪تێی هەڵدەکەن
سووتمان:........٪ئاگر گرتن و ماڵسووتان
سوراحی:.............٪پیاڵەی شەراب
سنوور:....................٪مەرز
سوێ:.................٪ئارەزوو
سوێ:..............٪ئاسۆ، ئاسۆگ
ستێر:............٪موخەفەفی ئەستێر، گۆڵاو
سەربەند:...٪سەر ئاهەنگی هەرگورانیەک کە
...........٪دووپاتە بکرێتەوە
سەخلەتی:....٪سارد و سەرما و تەڕو تووشی
...............٪نارەحەتی
سەما:...................٪عاسمان
سەما:...............٪رەقس، هەڵپەرین
سکڵ:.......................٪پولوو
سەنبول:.............٪نیشانە، رەمز
سەبرێ:..............٪سووکێ، هێواشێ
سێڵ:...................٪ساج
سۆ:..............٪تەشەنا بوونی برین

«ش»

شاپەرەک:.........٪پەپوولە، پەروانە
شەم:...................٪بۆن
شەم:...............٪شەمع، چرا
شۆڵە:................٪شوعلە، گر
شەونامە:.....٪راگەیاندەی سیاسی کە
...........٪بە شەو بڵاو بکرێتەوە
شووش:......٪رێک و راست و باریک
شەوی یەڵدا:.......٪درێژترین شەوی
........٪ساڵ کە ئاخرین شەوی پاییزە
شەوە:....٪ئاڵ، جانەوەرێکی خەیاڵی
........٪کە مناڵ دەگووشێ تا دەمرێ
شەونخوون:............٪شەو نەخەو،
.....................٪شەو بێدار
شەواو:.........٪بە شەودا ئاودانی گیا
.....................٪و چاندراو
شەوێن:........٪بە شەو داڵەوەراندنی
......................٪ئاژەڵ
شووڵ:.................٪توول، شوو
شێووەرد:.........٪شێو برینی زەوی و
...........٪کێڵانی زەوی لە دووبار
شەتەک:.........٪مەحکەم گرێ دان،
.................٪توونە پێچان
شێبا:........٪شنەی بڵاوێنی با، نەسیم
شەرارە:..............٪پولوی ئاگر
شەوبا:............٪بای کاتی شەو
شەوبا:....٪شەوبوایە، کاتی شەو بوایە

شۆفار:.............٪شەیتان و دووزمان،
.........................٪جاسووس
شوێن‌گیر:.......٪راوچیەک بە شوێن وردەی
.............٪نەچیردا بگەرێ
شێنەیی:............٪بە ئارامی بە هێواشی
شەتڵ:.......٪لقی رێحانە، باینجان، تووتن کە
...........٪لە کەردوو دا لێدرێ، شتڵ
شای مەردان:...........٪ناوی کێوێکە لە
..............٪ساروقامیش «بۆکان»
شەوەزەنگ:...............٪تاریکە شەو

«غ»

غەش:...............٪نادروستی، ناپاکی
غەنیم:............٪حەریف، دوژمن، رەقیب

«ف»

فریزوو:........٪هەرێز، جۆرەگیایەکی بژارە

«ق»

قاسید:.............٪نامەبەر
قاقر:..............٪وشکەڵانی، کەویر
قەشە:......٪ماسی سپی، قاشەماسی کە دەڵێن
...............٪لە خەو دا دیتنی باشە
قەڵەم کردن:..........٪پەی کردن بە قرتاندن
قەقنەس:...............٪سووتاو.
....٪پەرەندەیەکی ئەفسانەیی کە ئاگر لە خۆی
......٪بەردەدا و لە خۆڵەمێشە کەی قەقنەسی
..............٪دیکە دێنە دنیا

قسر:...........٪ئەستیور، غەیرەئاوس
قلیچ‌قایە:........٪نێوی کێوێکە لەسەر
...........٪چۆمی جەغەتوو لەبەشی
.................٪هەوشارەوە
قەڵپەزە:......٪شەپۆلی دەنگ‌داری ئاو
قەشمەرە:.......٪جوان و خوێن شیرین
قارقارە:.......٪تەختە سەهۆڵ کە ئاوی
.................٪چۆم دەی‌هێنێ
قنە:..........٪رێگا رۆینی باڵندە
قەزا:....................٪شار

«ک»

کولێج:..........٪دانشگاه، خوێندگە
کۆچی قوربان:..........٪بەرانە کەی
..............٪حەزرەتی ئیبراهیم،
.........٪هەرشتێ بۆ قوربانی داندرێ
کەویر:.......٪شۆرەکات و درو و داڵ
................٪بێ حاسڵات
کاولاش:........٪ئاشەکۆن، خەرابە،
....................٪کەلاوە
کەڵاورێژ:...٪پڕ بوونی شتێک لە ئاو و
...........٪پێی دا برژێتە خوار
کەوی بۆران پێچ:........٪کەوی لەبەر
..........٪سەرما و بۆران لە ترسان خۆ
..............٪بە ماڵاندا بکا
کاخ:...............٪قەڵای شاهان
کەژ:...............٪کێو، سەحرا

کەما:...............٪ گیایەکی کوێستانیە،
...............٪ کارگی کەما، مەشهوورە
کرخ:...............٪سست و بێ حس
کۆز:...........٪ماڵە چکۆلە بەرخ و کارژیلە
...........٪لە تەویلەدا دروستی دەکەن
کاوان:.............٪رژد و زەردومای کێو،
...........٪ تاشە بەردی لووتکەی کێو

«گ»

گەلۆ:...٪مونادایە یانی ئەی گەل ئەی خەڵکە
گەزراو:.............٪ گەستراو، گاز لێ گیراو
گرەزۆک:....٪سیفەتی منداڵێ کە زۆر بگری
گەروو:............٪قورروو، قورگ، ئەوک
گێژەو:........٪جێگای خۆل دانی باو دەریا
.......................٪و چۆم
گرانجان:.........٪ گرانفروش
گوروان:.......٪شین بوون، پێ گرتنی شەتڵی
.....................٪ گیا و گوڵ
گەراو:..........٪ئەوکانیانەهەر هاتنە دەرێ
......................٪دەبنە بەرد

«ل»

لێی کەمەوە:..............٪دەس بەرداریم،
....................٪ئێدی نەبارێنم
لێوار:.........٪قەراخ، کەرانەی چوم و دەریا
لاتیل:..........٪لە ژێر چاوەوە تەماشا کردن
لاوێن:.............٪شووڵی نەرمی دارە بی
لۆ:.............٪ گیایە کە

«م»

موجوعمە:..........٪دەفرێکی خری
...٪ گەورەنان و چێشتی لە سەر دادەنرا
مانی:............٪ پیغەمبەری نەققاش
موسەللەس:....٪موسللەسی بیرمودا لە
..............٪ئقیانووس ئەتلەس کە
............٪هەمووشت قووت دەدا.
میقنەعە:.........٪رووبەند، رووسەری
مەزامیر:.............٪جەمعی مزمار،
............٪واتە گۆرانی و ئاهەنگ
مەنجەڵ:.........٪قازان، دیگی گەورە
مەشعەر:............٪مەحەللی شعوور
مانگی بوخارا:.........٪ماە نەخشەب
.............٪یا مانگی سیام کە المقنع
.............٪سازی کرد بوو
مەزڵ:............٪مەنزل، ماڵ
میزراب:......٪وەسیلە لێدانی سیمی تار
مچورک:.............٪مووچرک،
............٪رەعشەی ئەندام، تەزوو
ماڵوو:..............٪مالت، مالتان
مەیان:............٪مەیدان، گۆرەپان
ملی بەکوین:.......٪عەزادار، رەشپۆش

«ن»

نامۆ:...............٪بێگانە، غەوارە
نایاب:.........٪شتێ کەم دەس کەوێ،
.....................٪بێ وێنە
نەفخ:..............٪با کردن، فوو

نەمام:..........٪خەڵف، داری تازە چەقاو

نەیار:................٪دوژمن

نایەکەوان:...........٪لەگەڵم ناسازێی

نوارین:............٪روانین، چاو لێ کردن

نیسان:............٪هەوەڵ مانگی بەهار

«و»

وەشت:.....................٪بارانە

وەرەز:...............٪توورە، بێ تاقەت

وادە:......................٪وەعدە

وست:....٪هەرەشە، بی دەنگ، شبەجوملەیە

واز:......٪هەڵگیراو، کرواە دژی دا خرا و باز

واز:.............٪ئیشتا، ئارەزوو، ویست

وشیار:.............٪هوشیار، ئاگا، زیرک

وی:...............٪ئەوی، ئەوجێگا

وانە:.....................٪درەس

وی:.........................٪ئەو

«هـ»

هەتڵە:......٪لێ شێوانی رێگا، انحراف

هاوێر:..٪جیاکردنەوەی مەڕ و بەرخ لە ران

هەڵ:.........٪فوورسەت، دەفەرت

هەودا:...............٪تاڵ، رشتە

هەوێن:..٪مایە، وەسیلەی گرسانی ماست

...............٪و پەنیروشتی وا

هەنا:...............٪هانا، پەنابردن

هەلووکێن:.....٪کایەیەکی منداڵانەیە

هەپک:........٪کایەیەکی منداڵانەیە

هۆبە:........٪چادر چیغی کوێستانچی

هەلووک:.........٪دارێکی چکۆلەی

.........٪سازکراوە بۆ یاری هەلووکێن

.....٪سەنبولی کەسێکە زۆر هەڵسورێ

.............٪و ماندوو بوون نەزانێ

«ی»

یەخسیر:...............٪ئەسیر

صداوسیمای جمهوری اسلامی ایران
کتابخانه
مرکز مهاباد

تێ بینی:

بۆمانای ئەم وشانە فەقەت لەو مانایە کەڵک وەرگیراوە لەم کتێبە دا هاتوە

بۆیە لە ماناکانی تری وشەکان خۆمان پاراستوە.

والسلام